# ئەمین فەیزی بەگ

## "سەربازێکی زانا و ئەدیبێکی سەرباز"





نیگاری: حەمە کاکە

ڕۆڤار

20

ڕۆڤار ڕۆژنامە - گۆڤار

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیریەو هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێک

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوو هەفتە جارێک دەری دەکات





بینای بورجی بەدەن روخا بەگوللەی حادیسات ئەمڕۆ    نەما قوەت لەئەژنۆمدا بڕا پشتم شکا شانم

# ئەمین فەیزی بەگ[i]

رەفیق حیلمی

ئەمین فەیزی بەگ، یەکێکە لە زانایانی بەناوبانگی کورد. عەسکەرێکی عالم و ئەدیبێکی عەسکەر بوو[ii].

لە زەمانی حکومەتی عوسمانی، کە هێشتا قۆڵ ئاغاسی بوو مودیری مەکتەبی عەسکەری بەغدا بوو. لەو وەقتەدا بە ناوی "ئیجمالی نەتایج" کتێبێکی نوسیوە کە خولاسەیەکی علومی ڕیازیات و تەبیعیاتە[iii].

بەینێکیش لە سلێمانی قوماندانی لیوا بوو. ئەو وەقتە ڕوتبەی میرئالای (کۆلۆنێل)ی هەبوو و (نالەپێ پان) کە یەکێك بوو لە عەشیرەتی هەمەوەند وە لەگەڵ ئەوانە بوو کە تابورێکی عەسکەری تورکیان لە لای دەربەندی بازیان ڕووت کردبوەوە، لە زەمانی قوماندانی ئەمین فەیزی بەگدا و لە سلێمانی کرا بە قەنارەدا (1326 ڕۆمی).

لە دوای ئەمە کە تەقاویت کرا، عومری خۆی هەر بە نووسین و خوێندن و گەڕان ڕابوارد. سیاحەتێکی ئەورووپایشی کرد و باقی عومری خۆی لە ئەستەمولدا بەسەربرد. بێجگە لە "اجمالی نتایج" بە ناوی "تفرقەی ریازیات" و "هەوای نسیمی" و "شعاعات"ەوە چەند ئەسەرێکی تریشی هێنابوە ناو. بەینێکی کەم پێش مردنیشی لەژێر ناوی "ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد"دا[iv]، کۆمەڵە شیعرێکی هەندێ لە شاعیرانی کوردی لە چاپ دا (1339 ڕۆمی). زۆر مەیلی لەسەر "ریازیات" و "ئەدەبیات" و لە ڕیازیاتی عالیەدا شارەزایی تەواوی هەبوو. هەرچەند لەگەڵ شیعر و ئەدەبدا خەریك نەدەبوو، بەڵام دیسانەوە بە ئوستادی شیعر و ئەدەب ناسراوە و لە شاعیرە بەناوبانگ و بە سەلیقەکان دەژمێردرێت. دۆستایەتی بەینی خۆی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی شاعیری هەرە بەناوبانگی کورد و موخابەرەیان لەگەڵ یەکتری بە شیعر، ئەم قسەیەمان ئیسبات دەکا، و ئەم جەوابنامەیە کە شێخ ڕەزا بە فارسی لە جەوابی کاغەزێکدا بۆ ئەمین فەیزی بەگی نوسیوە پایەی زانستی و ئەدەبی بۆ ئێمە دەردەخا.

ز نطفهء قلمت در مشیمهء قرطاس
نتیجه هاست به قیمت گرانتر از الماس[v]
صحیفه معجزه پیراست بسکه بون مریم
به بر گرفته موالید عیسوی انفاس[vi]
رسیده کار به جایی ترا امین فیضی



که جبرائیل امین خوانمت ز روی قیاس[vii]
هزار سال بمانی که این عجب نبود
بشر نیند مگر خضر زنده و الیاس[viii]

نووسین و موخابەرە لە بەینی شێخ ڕەزاو ئەمین فەیزی بەگدا ئیشی جارجارە نەبوە بەڵکو بە دائیم بوەو لە یەکتری دوور یا نزیك بووبن دۆستی ئەوان هەر بە گەرمی دەوامی کردوە. ئەمەیش کاغەزێکی تری شێخ ڕەزایە کە لە دوای دەرچوونی کتێبی "هەوای نەسیمی" و لە وەختێکدا کە "ئەمین فەیزی بەگ" لە "یەمەن" بوە بۆی ناردوە:

الا ای هنرمند و یار قدیمی
تویی خسراوانرا سزای ندیمی[ix]
ز حکمت بپرداختی نامهء تو
بدادی دران نامه داد حکیمی[x]

هوای نسیمی ازان گشته نامش

که جان پروراند هوای نسیمی[xi]

به دانش ترا هیچ همتا ندیدم

مگر جوهر فرد و درّ یتیمی[xii]

تو خواهی سفر در یمن دورتر کن

امین فیضیا در دل من مقیمی"[xiii]

بەم جەوابنامەدا وا دەردەکەوێت کە موخابرەی بەینی شێخ ڕەزاو ئەمین فەیزی بەگ هەر بە شیعر و بە زمانی فارسی بوە، و ئەمین بەگ خۆی فارسی ئیختیار کردبێ. ئەگینا شێخ ڕەزا بە موناسەبەت نەبوبێ بە تایبەتی لەگەڵ کوردێکدا زمانی فارسی بەکارنەهێناوە و بە شیعر و ئەدەبی کوردیدا ئوستادێکی گەورە و سەنعەتکارێکی بێهاوتا بوە. هەرچی وەکو ئەمین فەیزی بەگە لەژێر تەئسیری دەوری منداڵیدا کە لە حوجرەکانی سلێمانی بە فارسی خوێندویەتی و "موشعرینە"[xiv]ی کردوە، هیچ فەرقێکی لەوەدا نەبینوە کە لەگەڵ شێخ ڕەزادا بە فارسی موخابەرە بکاو یا بە کوردی. ئەگینا چ ئەمین فەیزی بەگ و چ شێخ ڕەزا، هەردووکیان لە شیعری تورکیشدا دەسێکی باڵایان بوو. حەتا "شعاعات" کە دیوانی ئەشعاری ئەمین فەیزی بەگە هەمووی بە "تورک"[xv]ییە، مەبەسمان ئەوەیە کە ئەمین فەیزی بەگ لەلای خۆی نەیویستوە بە تورکی کە زمانێکی بێگانەیە لەگەڵ شاعیرێکی کورد موخابەرە بکا. بەڵام لە لایەکی ترەوە نزیکی و خزمایەتی زمانەکانی کوردی و فارسی و عادەتی ئەو زەمانەی خەڵقی سلێمانی کە موخابەرەی بەینی خۆیان و زمانی حوجرە و قوتابخانەکان فارسی بوو، خستویەتیە هەڵەیەك کە بە دەرەجەیەك خۆی لێ پاراستوە. لەناو هەندێ لەو کاغەزانەی ترا کە شێخ ڕەزا بۆ ئەمین فەیزی نوسیوە ئەوانەی کە ناوی ئەمین فەیزی تیا وتراوە و بەهایەکی ئەدەبی هەیە لە ژێرەوە دەینوسین؛ لە کاغەزێکدا دەڵێ:

"مستم از جام بادهء فیضت

چون مسیحا ز فیض روح امین[xvi]

سالهای دراز باقی باد

به سلامت امین ما آمین[xvii]

وە لە کاغەزێکی تریشدا ئەمانەی بۆ دەنووسێت:

"تا به ضرب المثل همی گویند

که دعا از برای آمین است[xviii]

خاطرات شاد باد امین فیضی

زانکه دریای دانش و دین است"[xix]

ئێمە تەرجومەیەکی حاڵی تەواوی ئەمین فەیزی بەگمان لا نیە، بێجگە لەو ڕوباعیە کە لەلاپەڕە (24)دا نوسراوە و ئەم فەردە:

گەر ڕەفیقت یاری سادق بێ چە باکی ڕێگەتە

گەر کەسێ بەدخو لەگەڵتا بێ جەهەننەم جێگەتە

نە دیوان و نە چەن شیعر و غەزەلێکی تری کوردی خۆیمان لەژێر چنگدا نیەو دەستمان ناکەوێت؛ لەبەرئەوە بۆ ئیسباتی فەزڵ و هونەری ئەمین فەیز بەگ و پایەی شیعر و شاعیریەتی، بە ناچاری موراجەعەتمان بە بیرەوەری خۆمان و شایەتی (شهادتی) یەکێك لە شاعیرە زۆر گەورە و بەناوبانگەکانی دۆستی خۆی کرد. داخەکەم لە تاریخی سلێمانیشدا تەرجومەی حاڵی تەوای ئەمین فەیزی بەگ و حەتا تاریخی لە دایکبوون و مردنیشی نەنوسراوە، بەڵام من ئەگەر لەبیرم مابێ لە بەینی (1340 و 1341) ڕۆمیدا لە **وڵاتی غەریبیدا بە ڕەحمەت چوە و بە تەواوی نازانم لە کوێ** نێژراوە. ئەوەیشم لەبیرە کە لە تاریخی 1915 میلادیدا بە گەڕان لە سوریە بوو لە ژووری خانێکا لە (حلب) بە نەخۆشی کەوتبوو کە چووومە لای و بۆ ئاخر جار زیارەتم کرد.

بە ڕاستی کوردێکی بە جەوهەر و زاناو ئەدیب بوو. وەکو ئەمین زەکی بەگ ئەفەرموێت زۆریش بێ هەواو قەلەندەر مەشرەب بوو.

***

لەم کتێبەدا[xx] نیازمان نەبوو ئەوانەی کە بە زمانی خۆیان یەعنی بە کوردی "شیعر"یان نەنووسیبێ باسیان بکەین. چونکو مەبەسمان دەرخستنی شیعر و ئەدەبی کوردیە نەك دەرخستنی ئەو کوردانە کە خزمەتی ئەدەبیاتی بێگانەیان کردوە و زمانی خۆیان نازانن و نەیشیان ویستوە فێری بن. چونکو بۆ ئەو جۆرە کوردانە بگەڕێین زۆر بە داخەوە دەڵێم: کە لەناو میللەتەکانی شەرقدا گەلێ کوردی وا بوەو هەیە کە لە مەیدانی شیعر و ئەدەب و زانستی و سیاسەتدا گەیشتونەتە پایەیەکی زۆر بەرز و لە ڕێی پێگەیشتنی تورك و عەرەب و عەجەمدا خزمەتی زۆر گەورەیان کردوە.

بەڵام ئەمین فەیزی بەگ کە تا مردن و لە هەموو جێگەیەك لەگەڵ هاونیشتمانە کوردەکانی خۆیا، بە کوردی قسەی کردوە و دۆستەکانی تایبەتی و دایمی خۆی لە پێگەیشتوان و تێگەیشتوانی کورد هەڵبژاردوە، بەڵێ ئەمین فەیزی بەگ کە پایەی عیلم و زانستی و هونەری خۆی بە ئاساری عیلمی دەرخستبوو لەوە زیاتر دەرخستنی لە توانادا بوو، ئەو ئەمین فەیزیە کە "ئاکادەمی فرانسە" بە ڕەسمی تەقدیری کەماڵاتی کردبوو ئەگەر بە ڕۆح و گیان کورد نەبوایە لە هەموو باس و سوحبەتێکا شیعری کوردی نەدەخوێندەوەو شیعری زۆری گەلێك لە شاعیرە بەناوبانگەکانی کوردی لەبەر نەدەکرد یا لە بیری نەدەما. لەمەیش زیاتر لە ئاخری عومرا، لە جێگەیەکی وەکو ئەستەموڵ ئەو شیعرانەی لە وێنەی کتێبکدا و بە پارەی خۆی لە چاپ نەدەدا و بەناوی خزمەتی ئەدەبیاتی کوردەوە بە ڕەنج و بە پارە، خۆی نەدەخستە زەحمەتەوە. بە چاوێکی ئینساف لەم قسانە بفکرن کە

لە موقەدەمەی "ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد"دا نووسیویەتی: (ئودەباو شوعەرای کورد زۆرن لاکین (بەڵام) ئاساریان بە تەواوی جەمع و تەئلیف نەکراوە. من نیەتم کرد کە بەعزێ لە ئەشعاری کوردی بابان تەبع و نەشر بکەم تا بزانرێ موڵکی بابان چەند مەنبەعی فەیز و زەکایە "لە شیعری هەر شاعیرێ چەند پارچەیەکم ئینتیخاب کرد و لەو مونتەخەباتە ریسالەی "ئەنجومەنی ئەدیبان"م هێنایە وجود بەم وەسیلەیە تاڵبان و راغبان کەمێك خەلاس بوون لە شیعر نوسینەوە لەسەر دەفتەری پارچە پارچە".

دیقەت ئەفەرمون کە ئەمین فەیزی مەبەسی لەم ریسالەیە چیەو بە چ فیکرێك هێناویەتیە ناو؟!.



ئینجا لەبەر ئەم ڕۆحە بەرزەی ئەمین فەیزی هەرچەند شیعرە کوردیەکانی نەکەوتە دەسمان (چونکو ئەوە جێگەی شك نیە کە ئەمین فەیزی بێجگە لە تورکی و فارسی، بە کوردیش شیعری زۆری هەبوو خۆم لێم بیستبوو)، دیسانەوە دڵ بروایی- نادا- کە خاوەنی "ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد" لە زومرەی ئودەبای کوردا ناونەبرێت و بە قەدر ناشناسیمان زانی کوردێکی ئەدیب و بەوەفاو خۆشەویستێکی بڵند پایەی کورد، لێرەدا بە یادنەکەینەوەو بەناوی موبارەك و باسی پڕ فەیزی ئەوەو ئەم نامیلکە بچوکە موعەتەر و بۆنخۆش نەکەین..

پەراوێزەکان:

[i] لە کتێبی "شیعر و ئەدەبیاتی کوردی" وەرگیراوەو، لە نووسینی خوالێخۆشبوو مامۆستا "ڕەفیق حیلمی"یە، دەق وەکو خۆی نووسراوەتەوە.

[ii] کە جەیشی غەم هجومی کرد نیزامی عومری من تێکچو
ئیتر مومکن نیە ئاسایشی حاڵی پەرێشانم
بینای بورجی بەدەن ڕوخا بە گوللەی حادیسات ئیمڕۆ
نەما قوەت لە ئەژنۆما برا پیشتم شکا شانم

ئەمین فەیزی

[iii] چە عجب گر بە وجود تو بنازد بغداد
ای وجود تو محیط دو جهان استعداد
گرو از مهر برد ذرە بدان ناچیزی
اگر از رای منیر تو کند استمداد

"شێخ ڕەزا"

گرو: گرەو. اگر: ئەگەر.

سەیر نیە ئەگەر بە وجودی تۆوە بنازێ بەغدا، ئەی ئەو کەسەی کە وجودی تۆ ئابلوقە دەرە بە دوو جیهانی لێوەشاویدا.

گرەو لە خۆر دەباتەوە "زەرە" بەو هیچ و پیچی وردیلەییە ئەگەر داوای یارمەتی لە بیروڕای تۆ بکات (یاخۆ ئەگەر لە مەزنترین بە شەوق (واتا خۆر) سود وەربگرێ).

سەرنج.

1= لە هەندێ سەرچاوە، لە باتی: -

اگر از رای منیر تو کند استمداد، ئەم دێڕەی خوارەوە نووسراوە:-

اگر از نیر اعظم بکند استمداد

2= وا بەناوبانگە، کە ئەم دوو هەڵبەستە دەربارەی "موفتی زەهاوی"یە.

[iv] مەبەستی ئەم کتێبەیە.

[v] نطفة: تۆو. قلم: خامە، پێنووس.

مشیمە: منداڵ دان. قرطاس: کاغەز. نتیجە: بەر، ئەنجام. قیمەت: نرخ. الماس: ئەڵماس، بەردی گران با.

واتا: لەو تکانەوە کە لە پێنووسەکەتەوە ئەڕژێتە سەر لاپەڕەی کاغەز، شتی وەها دێتە بەر کە گرانترە لە ئەڵماس. ئەوەی ڕاستی چوواندنی تکە مەرەکەبی ناو قەڵەم بە "تۆو" و چواندنی لاپەڕەی کاغەز بە منداڵدان، و سەنگاندنی بەری هەردووکیان لەگەڵ یەك.. ئەمە هەر لە شێخ ڕەزا وەشاوەتەوە.

[vi] صحیفه: لاپەڕە. معجزه: لە توانابەدەر.

پیرا: ڕازاوە. بسکه: زۆر. چون مریم: وەك مەریەم. به بر گرفته: گرتویەتیە باوەش. موالید: ڕۆڵەگەل. عیسوی انفاس: هەناسە وەك عیسا.

واتا: نامەکەت لە توانای نووسەران بەدەرە، هەروەکو مەریەم بە موعجیزە زۆربەی نەفەسی پاکی گرتۆتە باوەش، ئەمیش شتی وای تیایە لە توانای کەسانی ترا نیە.

[vii] رسیده: گەییوو. کار: ئیش.

بەجایی: بەجێگەیی. خوانمت: بانگت دەکەم. زروی: لە ڕووی.

واتا: کار گەیوەتە جێی ئەی ئەمین فەیزی ناوت دەنێم جبرائیلی ئەمین.

[viii] واتا: هەزار ساڵ بمێنی، ئەمەش سەیر نیە! مەگەر مرۆڤ نین خدری زیندەو ئیلیاس، کە دەوترێ هەزارەها ساڵە ماون؟

سەرنج: 1– لە دیوانی "شێخ ڕەزا"دا، (چاپی بەغا 1946) لە باتی:

بشر نیند مگر خضر زندەو الیاس
شرافتت بمثل خضر زندەو الیاس

نوسراوە.

2–ئەم دێڕەش لە عەینی دیواندا هاتوە:

در این دیار "رضا" را بهرزه عمر گذشت
بجان رسیده گناهش بگردن افلاس

[ix] الا: ئاگاداریە. یار: دۆست. قدیمی: کۆن. تویی خسروان را: تۆی بۆ پاشایان. سزا: لایق، شایان. ندیمی: یاوەری.

واتا: ئەی هونەرمەند و دۆستی کۆن، تۆی شایستەی نەدیمی شایان.

[x] ز حکمت: لەژێری. پرداختی: ڕازاندوتەوە. نامەء: کاغەزی، کتێبی. بدادی: داوتە. دران: لە ئەوا. داد حکیمی: هونەری ژیری.

واتا: لە ژێریا نامەیەکت ڕازاندۆتەوە لەوا هونەری ژیریت دەرخستوە.

[xi] هەوای نەسیمی: بای فێنکی بەیانیان (ناوی کتێبەکەی ئەمین فەیزیشە). ازان: لەبەرئەوە.

گشتە نامش: بوە بە ناوی. کە جان پروراند: کە گیان پەروەردە دەکات.

هوای نسیمی: بای فێنکی بەیانیان.

واتا: بۆیە ناوی کتێبەکەت هەوای نەسیمییە چونکە وەك بای فێنك گیان دەبوژێنێتەوە.

[xii] به دانش: بە زانست، بەژیری. ترا: بۆ تۆ. هیچ همتا: هیچ هاوتاییێك. مگر. مەگەر.

جوهر فرد: گەوهەری تاقانە. در یتیمی: دوڕی نایابی.

واتا: هاوتای تۆم لە زانست نەدی مەگەر تۆ گەوهەری تاقانە و دوڕی یەکانەی.

[xiii] تو خواهی: تۆ ئەتەوێ. سفر: گەشت. از یمن: لە یەمەن. در دل من: لە دڵی منا. مقیمی: هەر هەی.

واتا: هاوتای تۆم لە زانستا نەدی مەگەر تۆ گەوهەری تاقانە و دوڕی هەر هەی و گەشتت نەکردوە.

[xiv] موشعرینە: شەڕە شیعر.

[xv] جەنابی محەمەد ئەمین زەکی بەگ" بە تاریخی سلێمانیدا "شعاعات"ی بە کوردی داناوە. "شیعر و ئەدەبیاتی کوردی"

[xvixvi] مستم: مەستم. از جام: لە جام. بادەء فیضت: بادەی لێشاو کردوت، بادەی بەخششت.

چون مسیحا: وەکو مەسیح. ز فیضی روح امین: لە بەخششی روح لئەمین (جبرائیل).

واتا: مەستم لە جامی بادەی بەخششت وەکو مەسیح لە بەخششی روح لئەمین.

[xvii] سالهای: ساڵەها. باد: ببێ.

واتا: ساڵەهای دوور و درێژ باقی بمێنێ بە سەلامەتی، ئەمینی ئێمە، ئامین خوایە.

[xviii] تا: تاوەکو. ضرب المثل/ قسەی پێشینان، مەتەڵۆك. گویند: ئەڵێن. برای: بۆ.

واتا: تا ئەودەمەی کە خەڵق بە مەتەڵۆك ئەڵێن: "دوعاکردن بۆ ئامین"ە.

[xix] خاطر: دڵ "وشەی "خاطرات" بۆ ناوی نادیارە کە ئەمین فەیزیە"

شاد: کەیف خۆش.

زانکە: لەبەرئەوەی. دەریا: زریە.

دانش: زانین، زانست. دین: ئایین.

واتا: دڵی پڕ کەیف و شادی بێ، ئەمین فەیزی کە زریەی زانست و ئاینە.

مەبەست لاپەڕە (24)ی کتێبی "شیعر و ئەدەبیاتی کوردی"یە.

[xx] مەبەست لە کتێبی "شیعر و ئەدەبیاتی کوردی"یە.

# ئەنجومەنی ئەدیبان

ئەمین فەیزی بەگ

**موقەدیمە[i]:**

ئودەباو شوعەرای کورد زۆرن، لاکین ئاساریان بە تەواوی جەمع و تەئلیف نەکراوە. من نیەتم کرد کە بەعزێ لە ئەشعاری کوردی بابان تەبع و نەشر بکەم تا بزانرێ موڵکی بابان[ii] چەند مەنبەعی فەیز و زەکایە.

لە شیعری هەر شاعیرێ چەند پارچەیەکم ئینتیخاب کرد لەو مونتەخەباتە ریسالەی "ئەنجومەنی ئەدیبان"م هێنایە وجود بەم وەسیلەیە تالبان و ڕاغبان کەمێك خەلاس بوون لە شیعر نووسینەوە لەسەر دەفتەری پارچە پارچە.

حە ،یشم کرد، لە پێش هەموو شتێ یەك نوبدە لە ئەوسافی ئەو ش یرانە بەیان بکەم. ئەوانە کە شوهرەتیان هەیە ئەمانەن:

( ·ولانا زیائەدین شێخ خالید)[iii]، (مەلا خدر- نالی)[iv]، (شێخ ڕەزا)[v]، (ئەحمەدی کۆر)[vi]، (مەلا سالح- ئاهی)[vii]، سەید عەبدوالرحیم- مەولەوی)[viii]، (هجری- کوردی)[ix]، (سالم)[x]و سائرە[xi].

"نالی" خەڵقی دێیەکە لە شارەزوور[xii] کە واقیع بوە لە تەرەف شەرقی سلێمانی، ئیسمی خاك و خۆڵە[xiii].

مەرحوم تەحسیلی لە قەرەداخ[xiv] لە سلێمانیدا ئیکمال کردوە، قەراخ شەش سەعات دوورە لە سلێمانیەوە. ،

(نالی) بۆ ئیفای حەج چوەتە حیجاز.

لەوێ دەرحەقی حەزرەتی فەخری ڕەسوڵ قەسیدەیەکی موکەمەل و موتەوەلی نەزم کردوە.

چوەتە ئەستەموڵ لە ئەسنای سوحبەتا لەگەڵ ئودەبا و فوزەلای ئەوێ گەلێ ئاساری فیکر و فەتانەتی نواندوەو زۆر مەزهەری تەوەجوه بوە. تا نیهایەتی عومری لە ستەموڵ ماوەتەوە.

مەدفەنی موبارەکی ئەوەتە لە ئۆسکودار[xv]. زەکای نالی ئینکار ناکرێ. لاکین ئەوەندەی سەنایعی لەفزیەی ئیستیعمال کردوە پیاو ڕەنگە بڵێ: شیعر ئەو نەتیجەی عیلم و ئیشتغالە.

(شێخ ڕەزا) لە عەشیرەتی تاڵەبانیە[xvi] لە قەزای بازیاندا[xvii] هاتۆتە دونیا. لە کەرکوکدا گەورە بوو. ئەویش وەك نالی هەم فەریزەی حەجی ئیفا کردبوو هەم چووبوە ئەستەموڵ. لە ئەسنای مولاقاتدا، بە قوەت زەکا و درایەتی خۆیەن گەلێ ئەکابر و ئەفازڵی ئەستەموڵی مات و مەبهوت کردبوو، یەکێ لەوانە ئەدیبی مەشهور کەمال بەگ[xviii] بوو.

باوکی مەرحومی کە مەشهورە بە شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانی هەم شێخێکی ساحێب نەزەر بوو هەم شاعیرێکی پڕ هونەر.

شیعری شێخ ڕەزا ئەوەڵەن وەهبی و فیتری بوو سانیەن کەسبی. لە چوار لیساندا شاعیر بوو بیلخاسە ئەشعاری کوردیەی هەموو عیبارەتە لە فەساحەت و بەلاغەت، لە نیکاتی دەقیقەو زەرافەت و سەعەتی قەریحە و مەعلوماتی خارجی تەقریرە.

لە بەغدا وەفاتی کرد، لە جیواری حەزرەتی گەیلانیدا مەدفونە. دوبەیتی ئاتی: کە هی خۆیەتی لەسەر کێلی قەبرەکەی حەك کراوە:

**یا رسول الله چه باشد چون سگ اسحاب کهف**



داخل جنت شوم در زمرهء احباب تو

او رود در جنت و من در جهنم کی رواست

او سگ اصحاب کهف و من سگ اسحاب تو[xix]

لەگەڵ بەندە (مەبەست ئەمین فەیزی خۆیەتی) موخابەرەی ئەغلەب بە نەزم بوو. چەند پارچە لەو نەزمانە کە بۆ بەندەی نووسیبوو ئەگەرچی فارسیشن بۆ تەبەڕوك کردم بە خاتیمەی ئەم ڕیسالەیە.

(هیجری و کوردی)[xx] و (سالم) ئەهلی سلێمانین شیعریان پڕ تەڕاوەت و عاشقانەیە.

بێینە سەر بەحسی مەولەوی:

مەولەوی ئەهلی هەورامانە[xxi]. لە ساداتی کرام و لە مەشایخی عیزامی نەقشبەندیە[xxii]. خەلیفەی شێخ عوسمانی[xxiii] تەوێڵەیە. مەسلەکی مەولەوی مەسلەکی زوهد و تەقوابوو. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیرێك بوو بێ نەزیر. هەورامان عیبارەتە لە بەعزێ دێهات کە واقیع بوون لە مابەینی کوردستانی عوسمانی[xxiv] و کوردستانی ئێراندا.

مەولەوی بە موقتەزای ئەو مەوقیعە کە تێدابوە هیچ چاوی بە شیعری فەرەنگ[xxv] نەکەوتوە لەگەڵ ئەوەش لەسەر ئوسلوبی ئەوان شیعری نەزم کردوە. لە قیتعەیەکدا مەسرەعی ئەوەڵی تەقفیە کردوە لەگەڵ مەسرەعی سالس و قافیەی مەسرەعی سانی و ڕێکخستوە لەگەڵ مەسرەعی ڕابع.

ئەو قیتعەیە لە ئاخری ئەم کتێبەدا نوسراوە. ئەم ئوسوڵە خیلافی ئوسوڵی شوعەرای ئێرانە و مەولەوی لە کەسی نەدیوە، مەحزەن بە حوسنی تەبیعەتی خۆی موناسبی زانیوە و ئیستعمالی کردوە.

لە مابەینی شوعەرای کوردا مەولەوی موقابیل بە نیزامیە[xxvi] ئەگەرچی لەهجەی هەورامان و لەهجەی سلێمانی نەختێ لەیەك دوورن. ئەمما شیعری مەولەوی ئەمەندە ئاهگوزار و ڕۆحنەوازە ئەهلی سلێمانی لە گۆرانیدا شیعری ئەو دەخوێننەوە.

(ئاهی) ئەهلی سلێمانیە، ئیشتغالی لەگەڵ عیلم بوە. زۆر وەقتی لە شاری کۆیەدا ڕابواردوە. شیعری ئەویش ڕەنگینە.

(ئەحمەدی کۆر) ئەهلی تەرفی سابلاخە.

عالم نەبوە ئەمما شیعری بە غایەت موزەیەن و غایەت عارفانەیە. ئەو نەعتی ریسالەتە کە لەم ریسالەدا موندەریجە هەموو مەزەیەنە بە سەنعەتی ڕەدعەجوز لەسەر سەدر. ئەحمەدی کۆر لایقە مولەقەب بێ بە (شاعیری پێغەمبەر). کەلامی هەموو پڕسۆزو گودازن.

حەزرەتی مەولانا زیائەدین شێخ خالید لە عەشیرەتی میکائیلیە. میکائیلی عەشیرەتێکە لە ئەترافی سلێمانی گەشتوگوزار دەکەن. جەنابی شێخ لە سلێمانی و لە ئەترافیا تەحسیلی کردوە.

بۆ ئیفای حەج دەچێتە (مەکەی موکەڕەمە). لەوێ زاتێك پێی دەڵێ کە بۆ تۆ فەیز و بەرەکەت لە تەرەف هیندستانەوە پەیدا دەبێ.

لە پاش عەودەتی بۆ سلێمانی ڕۆژێ هیندیەك دێتەلای، ئەو هیندیە شێخ هەڵدەگرێ بەسەر موڵکی ئێران و ئەفغاندا دەیبا تا داخڵی شاری دیهلی دەکا.

حەزرەتی مەولانا لە خزمەتی شا عەبدوڵلاه کە یەکێك بوو لە ئەولیای کاملین، تەریقەتی نەقشبەندی ئیقتباس دەکا.

لە زەرفی شەش مانگا مەئزون دەبێ، بۆ ئیرشاد دەچێتەوە سلێمانی، لاکین لەوێ ئیستراحەت ناکا، دەچێتە بەغدا، لەوێشەوە تەشریفی دەچێتە شام لەوێ وەفاتی کردوە. لە مەحەلەی سالحیەدا[xxvii] دەفینی خاکی ڕەحمەت بوە.

شێخ لە هەموو عولومی زاهیرە و باتینەدا ساحێب ئیقتیدار بوە، هەر لەگەڵ تەدریس و ئیرشاد مەشغول بوە. شیعر نەزم کردنی نەکردوە بە مەسلەك بۆ خۆی. مەعە هازا مەرتەبەی شاعیرێتی لە مەرتەبەی حافز[xxviii] و سەعدی[xxix] زیاتر نەبێ کەمتر نیە.

دیوانی کە بە ئیرادەی سوڵتان عەبدولمەجید خان تەبع کراو، ئەگەر تەدقیق بکرێ سدقی ئیفادەی ئێمە مەعلوم دەبێ، ئەمما ئەوەندە هەیە شیعری کوردی کەم گوتوە. مەناقبی کەشف و کەراماتی زۆرە.

زەرافەتی تەبعی عارف ئەفەندیش شایانی تەحسینە[xxx]

پەراوێزەکان:

---

[i] ئەم "موقەدیمە"یە هی بنەڕەتی کتێبەکەیە، واتە کتێبی "ئەنجومەنی ئەدیبان" و لە نووسینی "ئەمین فەیزی بەگ" خۆیەتی، بەڵام کۆڕی زانیاری کورد ساڵی 1982 وێڕای پێشەکییەك و هەندێ پەراوێزی بۆ نووسیوە و سەرلەنوێ چاپی کردۆتەوە، ئێمەش لەو سەرچاوەیەوە وەرمانگرتووەو لێرەدا بڵاومان کردۆتەوە.

[ii] موڵکی بابان:

مەبەستی وڵاتی بابانە کە بریتی بوو لە میرنشینێك نزیکەی (300) ساڵ خۆی گرت تا لە ساڵی 1850 زاینیدا هێجگاری ڕووخا. میرە بەناوبانگەکانی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەو میر بەکرە سوور و سلێمان پاشای گەورە (لە قەڵاچوالان) و شاغازیی لەشکرشکێن و ئیبراهیم پاشا بنیاتنەری شاری سلێمانی و ئەوڕەحمان پاشاو کوڕەکانی: مەحمود پاشاو سلێمان پاشاو ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشا.

وڵاتی بابان بە ناوچەی ئێستای سلێمانی ئەوترا، بە گوڵعەنبەر و هەڵەبجەو شارەزوور و شارباژێڕ و سرۆچك و ماوەت و پشدەر و قەرەداغ و پێنجوێنەوە.

هەندێ جار موڵکی بابان پەرەی دەسەند تا دەگەیشتە (زەنگاباد- مەندەلی- بەدرەو جەسان) لەولایشەوە بۆ ئاڵتون کۆپری و کۆیەو هەریر

جاری وا بوە کەرکوکیشی نەبواردوە و لەولا تریشەوە سنەی ئێرانی گرتۆتەوە.

بەڵام ئەم کەرخ و سنوورانە هێجگاری نەبوون، بەڵکو هەر لە زیاد و کەمیدا بوون لە هەموو لایەکەوە.

[iii] مەولانا خالید:

زیادئەدین خالید کوڕی ئەحمەدی کوڕی حسێن لە عەشیرەتی جاف، کە لە قەرەداغ لە ساڵی (1193 ك- 1779ز) لە دایك بوەو لە شام لە ساڵی (1242ك 1826ز) فەرمانی یەزدانی بەجێهێناوە.

[iv] نالی:

"نالی" ناوی خدر کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی لە خێڵی ئالی بەگی میکاییلیە. ساڵی (1215ك-1800ز) لە گوندی (خاك و خۆڵ) لە ڕۆژاوای دەشتی شارەزوور هاتۆتە دونیاوە. لە قەرەداغ و سنەو سابلاخ و هەڵەبجە خوێندنی علومی ئیسلامی تەواوکردوە، پاشان هاتۆتە شاری سلێمانی بۆ ماوەیەك جێگیر بوە. لەلای میرەکانی بابان ڕێز و پایەیەکی بەرزی هەبوە.

ئەم شاعیرە بە سەردەستەی شاعیرانی ناوچەی شارەزوور و میرنشینی بابان دەژمێردرێت لەبەرئەوەی لە ئەنجامی بارێکی مێژوویی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی تایبەتیدا ئەو هەلەی بۆ ڕەخساوە کە یەکەم جار زمانی گفتوگۆ کردنی ناوچەی سلێمانی هەڵبژێرێ و بەهرەی ئەدەبی وەك شاعیرێك بەم شێوەیە (بەم زارە) دەربڕێ. لە مەیشدا دەوری دامەزرێنەری هەیە چونکە لەوەوبەر یا بە زاری "گۆران" یا بە زاری "بۆتان" هۆنراوە وتراوە لە پاڵی زمانی فارسی و زمانی عەرەبیدا.

لە ڕووی پەرەسەندنی ئەدەبیەوە (نالی) پۆپەی ئەو دەستە زانا و شاعیرانەیە کە پشتێك یان دوو پشت بەر لەمدا، لە ناوچەی کوردستانی نێوەڕۆدا هەڵکەوتوون و جاروبارو تاك و تەرا هەڵبەستیان بە شێوەی سلێمانی داناوە، وەکو ئیبن ئەلحاج و شێخ مارفی نۆدێ و موفتی زەهاوی و عەبدوڵلای بێتوشی و مەلاونا خالید.

(نالی) لوتکە و پۆپەیە، بە بەراورد بەم زاناو نووسەر و شاعیرانە، چونکە ئەم دەستە ڕووناکبیرە لەبەر هەر هۆیەك بێ زۆرتر بەهرەیان تەرخانی خزمەتکردنی زمانی عەرەبی و فارسی کردوەو، کەم دابێژی نەبێ بە زاری سلێمانی شیعریان نەوتوە، ئەگەرچی هێندێکیان مەولانا خالید- بە زاری گۆران هۆنراوەیان داناوە، چونکە ئەم ئەدەبی گۆرانە میراتێکی دێرینەی چەند سەد ساڵە بوە.

بنیاتنانی شاری سلێمانی (1784ز) و بوونی میرنشینی بابان پاڵ پێوەنەرێکی بەهێز بوون بۆ تەقینەوەی بەهرەی شاعیرێتی (نالی). ڕاستی ئەم بارە ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتیە نوێیە بوە کە نەیهێشتوە ئەم بەهرەیە وشك بێتەوە، دوابەدوای خۆیشیدا شاعیری مەزن و گەورەی پێگەیاندوە، وەکو:

(سالم) و (کوردی) و (مەحوی) و (حاجی قادری کۆیی) و (حەریق) و (شێخ ڕەزا) و (کەیفی)، کە لقوپۆپی ئەم قوتابخانە ئەدەبیەن کە لە لایەن سەردەستەکەیانەوە دامەزراوەو، لە پاشانیشدا برەوی سەندوەو بڵاوبۆتەوە بە هەموو ناوچەی کوردستانی نێوەڕۆدا هەتا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بوە بە بناغەیەکی پتەو بۆ زمانی ئەدەبی یەککرتوو.

ئەم شاعیرە گەورەیە لە پاش ساڵی 1840 ز بە ناچای شاری سلێمانی بەجێهێشوەو لە پاشانا چۆتە شام پاشان لە ئەستەموڵ جێگیر بوە، تا لە ساڵی 1856ز دا، لەوێ کۆچی دوایی کردوە، هەر لەوێش بە خاك سپێراوە.

[v] شێخ ڕەزا:

شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانیە. لە ساڵی (1253ك)دا لە دێی (قرخ) هاتۆتە دنیاوە.

سەرەتا لەلای باوکی دەستی کردوە بە خوێندن، و ئەمجا بۆ تەواو وەرگرتنی زانستی لە کەرکوکەوە چوەتە کۆیە. شێخ ڕەزا، شارەزایی لە هەر چوار زمان، کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبیدا هەبوەو بەهەر چوار زمان شیعری وتوە و شیعریشی زۆر ڕەوانەو بەهرەیی توانایی لە مەیدانی ئەدەبدا پیشان دەدات. شاعیر زۆرتر لە (هەجو)دا ناوبانگی دەرکردوە و بێگومان شاسواری ئەم جۆرە شیعرەیە.

شێخ ڕەزا لە ساڵی (1327 ك- 1909ز) لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە و لە گۆڕستانی گەیلانیدا نێژراوە.

[vi] ئەحمەدی کۆر:

لە دێی (شێوەسماك)ی سەر بە (سابلاخ- مەهاباد) لەدایك بوە.

بنەماڵەکەیان کورد و سوننی مەزەب بوون. ئەم کۆرە نەخوێندەوار و چاوساخ بوە، پاشان بە هۆی چاوئێشەوە کوێر بوە. بە منداڵی دەنگی خۆش و زیرەك بوە، خەریکی گۆرانی وتن بوە و خۆی هەڵبەستەکانی خۆی پێکهێناوە.

ئەم زیرەکیە زگماکیە کردوویە بە "شایەر".

پاش ژن خواستن کچێکی جوانی بە ناوی "لەیلا" و دوو کوڕی بوە بە ناوی "قادر" و "محەمەد"، پاش ماوەیەك لە گوندی "شێوەسماك"وە باردەکات بۆ دێی "عەمبار". کوێخای دێی "عەمبار" حەز لە "لەیلا"ی کچی دەکات و "ئەحمەد" نایداتێ و دەیدا بە "ڕەسوڵ موسا" ناوێکی خزمی خۆی. کوێخا زویر دەبێ و لێیان دەکەوێتە بەهانە. قادری کوڕە گەورەی لە ترسی بەهانەی کوێخا هەڵدێ و ڕوودەکاتە شاری سلێمانی و لەوێ دەمێنێتەوە.

ئەحمەدی کۆریش بە دوای کوڕەکەیا ڕوودەکاتە "سلێمانی" و لەوێ دەکەوێتە داوی شێخێکی بەناوبانگ (ڕەنگە کاك ئەحمەدی شێخ، یا شێخ عەبدولکەریمی کەس نەزانی یەکەم، یا شێخ حەسەن قەرەچیوار بووبێ)، واز لە مەقام و گۆرانی وتن دێنێ و دەگەڕێتەوە بۆ سابلاخ و لەوێ دەکەوێتە هۆنینەوەی هەڵبەستی ئاینی و بەمجۆرە بە (شێخ ئەحمەدی کۆر) و (مەلا ئەحمەدی کۆر) ناوبانگ پەیدادەکات، و پاش ماوەیەك هەر لە دێی "عەمبار" کۆچی دوایی دەکات.

ئەم پیاوە ناوی باوك و باپیرانی نەزانراوەو مێژووی ژیانیشی نادیارە، تەنیا لە هەڵبەستێکی خۆیدا وتویە:

گەر کەسێ کا پرسیارە
بابی مەعلوم ئەو شمارە
چو لە هیجرەت یەك هەزارە
دو سەد و شەست و بواج

وشەی (بواج) بە ژمارەی ئەلفوبێی ئەبجەد دەکاتە (12). دیارە ئەم پارچە هەڵبەستەی ساڵی 1272 وتـوە، و دەبێ بڵێین لـە سـەدەی سێزدەیەمی کۆچیدا ژیاوەو جا لەبەر هەڵبەستەکانی دەبێ ناوبنرێ "هەستیاری شەیدای پێغەمبەر".

دیوانێکی پڕ لە هەڵەی "ئەحمەدی کۆر" کە تێکەڵە لە فارسی- عەرەبی- کوردی (ساڵی 1344 فاسی- 1965ز) لە مەهاباد (خۆی دەڵێ پاکستان) لە لایەن (محەمەد ئەمین میسری)یەوە چاپکراوە و پێشەکیەکی پڕ لە ئەفسانە و قسەی پڕوپوچی بۆ نوسراوە، ئە هەڵبەستەکان دەخوێندرێنەوە و نە پێشەکیەکەی.

سەرنج:

دەبێ ئەمەش ڕوون بکەینەوە، لە (ئۆمەر گوممەتی) لای (کۆیە) هەشتا ساڵ لەمەوبەر مەلایەک هەبوو ناوی (مەلا ئەحمەدی کۆر) بوە، پیاوێکی زیرەک و شاعیرێکی مەزن بوە، دوو کوڕی هەبوو ناویان (نور محەمەد) و (محەمەد نور) بوو، هەردوو مەلا و دەوڵەمەند و سوارچاک بوون. ئەم دوو ئەحمەدی کۆرە لە یەک جیاوازن.

[vii] ناهی:

ساڵح ئەفەندی، خەڵکی سلێمانیە و لە شاعیرە پایەبەرزەکانی کوردە. لە سەدەی سیانزەهەم و چواردەهەمی کۆچیدا ژیاوە. زۆربەی ژیانی لە شاری (کۆیە) بردۆتە سەر، زانایەکی نایاب و شاعیرێکی دڵنەرم و پرسۆز بوە و هەڵبەست و غەزەلیاتی زۆری هەیە بە زمانی کوردی.

[viii] مەولەوی:

شاعیری بەرزی ئاسمانی کوردەواری "مەولەوی" ناوی "عەبدورەحیم و کوڕی مەلا سەعید"ە لە ساڵی "1806"دا، لە دێی "تاوەگۆزیی" هاتۆتە دنیاوە.

"مەولەوی" خاوەنی شیعری ناسک و دڵڕفێن و پرسۆزەن هەروەها بە جوانترین هۆنراوە باسی دیمەنی سروشتی ناوچەی کوردستانی کردوە.

لە ساڵی (1882ز)دا، کۆچی دوایی کردوە و لە دێی "سەرشاتە" نێژراوە.

[ix] کوردی:

ناوی "مستەفا" و کوڕی مەحمود بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقرانە. لە ساڵی (1227ک- 1812ز)دا، لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە. هەر لە سلێمانی خراوەتە بەر خوێندن و لە پاشا هەندێ خوێندنی زانیاری ئیسلامیشی لە حوجرەی فەقێیان خوێندوە.

"مستەفا بەگ" ئەدیبێکی پایەبەرز و شاعیرێکی شیعر ڕەوان بوە، هەروەها زمان و ئەدەبیاتی فارسی چاک زانیوە، و لە عەرەبی و تورکیشدا دەستی بوە.

بۆ خۆی دوو نازناوی شیعری هەڵبژاردوە، یەکەمیان (کوردی) و دوەمیان "هیجری".

(کوردی) بە چاوێکی بەرزەوە سەیرکراوە لە لایەن شاعیرانی کوردەوە. حاجی قادری کۆیی کە باسی "کوردی" دەکا دەڵێ:

شەهسواری بەلاغەتی کوردان
یەکەتازی فەساحەتی بابان
مستەفایە تەخەلوسی کوردی
غەزەلی کردە بەر بوتی کوردی

"کوردی" لە ساڵی "1268 ک- 1851ز"دا کۆچی دوایی کردوە و لە گردی "سەیوان" نێژراوە.

[x] سالم:

ناوی عەبدورەحمان و کوڕی محەمەد بەگی قەرەجەهەنەمی کوڕی ئەحمەد بەگ و لە بنەماڵەی ساحێبقران، لە ساڵی (1800ز)دا لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە. وەکو هاودەمەکانی خۆی لە حوجرەی فەقێیان خوێندوویەتی، بەڵام تەواوی نەکردوە. زۆر حەزی لە دەنگوباسی ئەدەبی کردوە و بە تایبەتی شەیدای شیعری "نالی" و "کەلیم"ی هەمەدانی بوە.

"سالم" یەکێکە لە پایەبەرزەکانی ڕێبازگەی کرمانجی خواروو لە شیعری کوردیدا، (وەکو ئاشکرایە "سالم" لەگەڵ "نالی" و "کوردی"دا ئەژمێردرێن بە دامەزرێنەرانی ئەم ڕێبازگەیە).

"سالم" لە ساڵی (1866ز)دا ماڵئاوایی جیهانی کردوە و لە گردی "سەیوان" نێژراوە.

[xi] سائرە:

واتا "خەڵکی" تر.

[xii] شارەزوور:

ناوچەیەکی بە پیت و بەرەکەتە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانیەوە. لە عەربەتەوە دەست پێدەکات دەگاتە بناری هەڵەبجە و خورماڵ و هەندێ دێهاتی (قەزای دەربەندیخان)ی ئێستاش دەگرێتەوە. پانایییەکەی (656) کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. دەڵێن لە کاتی خۆیدا شارێکی هێجگار گەورە بوە. واتاکەشی بە (شاری نەرم) یاخود (ناوچەی نەرم) دێت، دەبێ زوو دەریاچەیەک بووبێت، وا ئێستاش بە ناوی حەوزەکەی دەربەندیخان نیوەی زیاتر بوە بە دەریاچە.

لە سەردەمی عوسمانیدا شارەزوور ناو بوە بۆ ویلایەت و ناوچەکەی شاری کەرکوک بووە، پاشان ناوی ویلایەتی شارەزوور گۆڕا بە ویلایەتی موسڵ.

ناحیەیەکیش هەیە بە ناوی شارەزوورەوە کە ئێستا مەرکەزەکەی (سەیدسادقە).

[xiii] خاک و خۆڵ:

دێیەکە دەکەوێتە سەر ڕوباری تانجەرۆ، لە ناحیەی تانجەرۆی سەر بە قەزای مەرکەزی سلێمانی، نزیکەی (28) کیلۆمەترێک دەبێت لە سلێمانیەوە. دێیەکی بچووکی چەند ماڵیە ناوچەکەی، ناوچەی شارەزوور و دانیشتوانی لە تیرەی جافن.

[xiv] قەراخ:

دێیەکی گەورەیە دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری سلێمانی و (40) کیلۆمەترێک لێوەی دوورە، مەرکەزی ناحیەی "قەرەداخ"ە سەر بە قەزای سلێمانییە . ناوی قەرەداخ (مەرکەز) لە بنچینەدا "زەردیاوا"یە.

قەرەداخ ناوبانگی بە زنجیرە شاخ و دەربەندەکانی دەرکردوە کە لە دەربەندی بازیانەوە دەستپێدەکات بۆ دەربەندیخان، کە ئەمانەن،

دەربەندەکان: بازیان و باسەڕە و سەگرمە و جافەران و گۆشان و داری زەرد و ئەستیل و گاوڕ و تەکیە، کە ئەم دەربەندانە (قۆپی)شیان پێ دەڵێن.

[xv] ئۆسکودار:

لە بنەڕەتا شارێ بوو لە بەشی ئانادۆڵی تورکیا بەرامبەر بە گەلی مەرمەڕەی شاری ئەستەموڵ. شوێنێکی زۆر جوان و ڕێکوپێک بوو.

گوایە لە (خریسرپولیس- شاری ئالتون)ەوە هاتوە. هەروەها ئۆسکۆدار شارێکە لە ویلایەتی ئەدرنەدا.

[xvi] تاڵەبانی:

تاڵەبان خۆی دێیەکی بچووکە دەکەوێتە پشت ڕووباری باسەڕەوە لە ناوچەی چەمچەماڵدا.

شێخەکانی تاڵەبانی لەم دێیەدا هاتوون و بە ڕەگەز و بنەچە دەچنەو سەر مەلا مەحمودی زەنگنە. ئێستا شێخەکانی تاڵەبانی لە ناوچەی کفری و خانەقین و قادرکەرەم و تاوغ و قەرەحەسەن و کۆیەدا هەن.

[xvii] بازیان:

ناحیەیەکە سەر بە قەزای مەرکەزی سلێمانی و مەرکەزەکەی (تەینال)ە، کە ئەکەوێتە سەر شەقامەڕێی بەینی کەرکوك و سلێمانی و نزیکەی (24) کیلۆمەترەێك لە سلێمانیەوە دوورە.

دەربەندی بازیانیش هەر لەم ناوچەدایە کە نزیکەی (35) کیلۆمەتر لە سلێمانیەوە دوورە. دەربەندی بازیان بە قاپی بۆ ناوچەی سلێمانی دانەنراو گەلێك ڕووداو و شەڕی گرنگی تێدابوە.

[xviii] کەمال بەگ:

مەبەست لە "نامیق کەمال"ە، شاعیری نیشتمانپەروەری گەورەی تورکە. لە ساڵی (1840ز)دا لە شاری (تیکرداخ) هاتۆتە دنیاوە. ئەم شاعیرە زۆر بە مەردانە و ئازایەتی دژی ڕژێمی دواکەتووی عوسمانلی ڕاوەستابوو، بۆیە زۆرجار دووردەخرایەوە لە ئەستەموڵ، بەڵام لە ڕێبازی نیشتمانپەروەری خۆی هەرگیز لای نەدەدا.

(نامیق کەمال) جگە لەوەی شاعیر بوو خەریکی ڕۆژنامەگەریش بوە، هەروەها دەستی کردوە بە نووسینی چیرۆك و شانۆگەری.

لە ساڵی (1882 ز)دا، کۆچی دوایی کردوە و لەسەر وەسیەتی خۆی لە "بۆلایر" نێژراوە.

[xix] واتای ئەم دوو بەیتە بە کوردی:

ئەی فرستادەی خوا! چی دەبێ وەکو سەگی یارانی ئەشکەوت بچمە بەهەشتەوە لەگەڵ دەستەی خۆشەویستانی تۆ؟ کەی ڕەوایە ئەو بچێت بۆ بەهەشت و من بچم بۆ جەهەنەم؟ ئەو سەگی یارانی ئەشکەوتە و من سەگی یارانی تۆ، مەبەست لە یارانی ئەشکەوت، داستانێکە لە قورئانی کەریمدا هاتوە. کە چەند کەسێ لە دەس دەقیانوسی ڕایان کردوە و خۆیان کردوە بە ئەشکەوتێکدا و لەوێ سێ سەدەیێ خەویان لێ کەوتوە، و کە لە خەو هەستاون و یەکێکیان بە دزیەوە چوە بۆ نان پەیداکردن تێگەییون ئەو دەورانە گۆڕاوە.

ئەم کابرایانە دەربارەی ژمارەیان بیروڕا ناکۆکە، و سەگێکیشیان لەگەڵ بوە. بەڵام باسی چوونە بەهەشتیان لە قورئاندا نیە، چە جای چوونە بەهەشتی سەگەکەیان؟!

[xx] (هیجری و کوردی) هەردوو نازناون بۆ شاعیری بەناوبانگی کورد، (مستەفا بەگی کوردی).

[xxi] هەورامان:

ناوچەی هەورامان ناوچەیەکی شاخاوی پڕ لە دارستانی چڕو ئاو و ئەشکەوت و دیمەنی جوانە. دەکەوێتە ناوەندی عێراق و ئێرانەوە، بەشی (لهون)ی دەکەوێتە ڕۆژئاوای زنجیرە شاخەکەوە لە عێراقدا و بەشی (تەخت)یشی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی زنجیرە شاخەکەوە لە ئێراندا.

دێیەکانی بیارەو تەوێڵە لە عێراقدا بەناوبانگن و بیارە مەرکەزی ناحیەیە.

دانیشتوانی ئەم ناوچەیە کە (هەورامی)یان پێ دەڵێن: ناوبانگیان بە ئازایەتی لە ئیشکردندا دەرکردوە.

[xxii] تەریقەی نەقشبەندی:

یەکێکە لەو ڕچە دەروێشی و سۆفیانەی ئیسلام کە لە کوردستاندا پەیڕەوی کراوە، کە یەکەمیان ڕێگای قادریە کە شێخ عەبدولقادری گەیلانی دایمەزراندوە و دوهەمیان نەقشبەندیە کە مەولانا خالید لە کوردستاندا سەرلەنوێ بەناوی (تەریقەی موجەددیە) بڵاوی کردۆتەوە و شێخ عوسمانی سەراجەدینی خەلیفەشی لە هەوراماندا بڵاویکردۆتەوە.

لە سلێمانی خانەقای مەولانا کە ئێستا نوێژی جومعەی تیا دەکرێت، مەحوود پاشای بابان بۆ ئەوی دروست کردوە. مەولانا خالید ئەم ڕێگایەی لە شێخ عەبدولای دەهلەوی وەرگرتوە لە هندستان. مەولانا مورید و قوتابی هێجگار زۆر بوە، جگە لەوە کتێبی ئاینی و نووسینی پوختی هەیە.

ئەم ڕچەیە لە بنچنیەدا شێخ محمد بەهائەدین بوخاری نەقشبەندی دایمەزراندوە.

[xxiii] شێخ عوسمانی تەوێڵە:

ناوبانگی بە شێخی (سراج الدین) دەرکردوە، یەکێکە لە خەلیفەکانی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی). ساڵی (1189ك) لە تەوێڵە هاتۆتە دنیاوە. زۆربەی ڕۆژگاری ژیانی لە ڕێگەی نەقشبەندی و ئامۆژگاری و ڕێگا نانەبەر خەڵکدا ڕابواردوە. ساڵی (1284ك) فەرمانی یەزدانی بەجێهێناوەو هەر لە تەوێڵە نێژراوە.

[xxiv] کوردستانی عوسمانی:

مەبەست (کوردستانی عێراق)ە.

[xxv] فەرەنگ:

لە کوردستاندا لە کۆنەوە فەرەنگ بە ئەوروپاییەکان دەوترا. بە مەلیکی فەرەنسەیان دەوت: قەڕاڵی فەرەنگ، ئەمەش لەگەڵ (افرنج)دا یەکن.

[xxvi] نیزامی گەنجەوی:

ئیلیاس کوڕی یوسف کوڕی زەکی کوڕی موئەیەد- کە بە ناوی کوڕەکەیەوە بە ئەبو محەمەد و بە نازناوی (نیزامەدین)وە، بە حەکیمی "نیزامی" ناسراوە: ساڵی (530-یا-535ك) (1135-یا- 1140ز) لە شاری گەنجە لەدایکبوە.

گەنجە: شارێکی کوردەواری کۆنە، هی سەردارانی ڕەوادی بوو، لە سەردەمی قەیسەرێتیدا داگیرکراوە و ناونراوە "ئەلیەزابات پۆڵ". پاش ئەوە لە سەردەمی سۆڤێتیا ناوی گۆڕدراوە بە "کیرۆف ئاباد".

ئیلیاس نیزامی: سەرگوزەشتی تەواوی دیار نیە، بە منداڵی خراوەتەت قوتابخانە، فارسی و عەرەبی چاك فێربوە، ڕەنگە تورکیشی زانیبێ.

فارسەکان بە فارسی دەزانن و تورکەکانی ئازەربایجانیش بە تورکی دادەنێن، کەچی نە ئەویانە و نە ئەمیانە و کوردێکی کوردبەچەیە. لەبەرئەوەی میهر و بەزەیی باوکێتی نەچێشتوە، یادی چاکەی باوکی ناکاتەوە. وا دیارە هێشتا منداڵ بوە باوکی دایکی تەڵاق داوە، یا ژنی هێناوەتە سەری و لە ماڵ دەریکردوە، لەبەرئەمە "نیزامی" لە ماڵی "خەواجە عومەر"ی خاڵی ژیاوە و هەڵچوە و پێگەیوە و زیرەکیەکەی بە وڵاتانا پرتەوی داوە، ئەوانەی گەوهەرناسن و هەستیارشناس، نیزامی لە فیردەوسی بە باڵاتر دەزانن، لەبەرئەوەی فیردەوسی هەڵبەستەری

بیروڕای مێژوویی بەر لە خۆیەتی و کەرەسەکانی ئامادە بوە، بەڵام گەنجەوی هۆنەرەوەی بیروڕای داهێنراوی چیرۆکانەی خۆیەتی، و سەر ئامەدی ئەم بابەتەیە.

نیزامی سێ ژنی هێناوە، و نازانری چەند منداڵێ هەبوە تەنیا ناوی "محەمەد"ی کوڕی دیارە کە دەبێ ساڵی (570ك) (1174ز) لە دایك بووبێ، چۆن لە کاتی دانانی (لەیلی و مەجنون)دا چواردە ساڵان بوە.

نیزامی برایەکی هەستیاری بەناوبانگیشی هەبوە ناوی (قەوامی موتەڕەزی) بوە، دیوانێکی هەڵبەستی ئەو کە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا نوسراوەتەوە، لە مۆزەخانەی بەریتانیادایە.

بەنرخترین پاشماوەی نیزامی "خەمسە"یە، واتا "پێنج گەنج" کە ئەمانەن:

1-مەخزەن ئەسرار:

وادیارە لە (561ك-1165ز)دا نوسیویە و پێشکەشی کردوە بە "ئیلدەکز"ی ئەتابەگی ئازەربایجان.

2-خوسرەو و شیرین:

وادیارە لە (571ك-1175ز)دا نوسیویەتی حەوت هەزار هەڵبەستە پێشکەشی کردوە بە دوو کوڕەکەی "ئیلدەکز" (محەمەد و قزل ئەرسەلان) کە ئەمی دواییان دێی "حەمدون"ی بۆ مایەی ژیان داوەتێ.

3-لەیلێ و مەجنون:

لە (584ك- 1188ز)دا نوسیویەو چوار هەزار هەڵبەستەو پێشکەشی کردوە بە ئەخەستان مەنوچەهری" شای شیروان، کە لەوەوبەر "خاقانی"ش پێیدا هەڵداوە.

4-ئەسکەندەرنامە:

لە (587ك-1191ز) نوسیویەو پیشکەشی کردوە بە یەکەم عیزەدین مەسعودی ئەتابەگی موسڵ و دەهەزار هەڵبەستە.

5-بەهرام نامە (هەفت پەیکەر):

لە (595ك-تا-599ك) (1198-1202ز)دا نوسیویە و پێنج هەزار هەڵبەستە، پێشکەشی کردوە بە "میر عەلائەدین گلپەی ڕەوادی" دواترین سەرداری کوردی "ئەڕان و ئازەربایجان" لە بنەماڵەی (میر ئەحمەدیل) کە زۆری خۆشویستوە و سەرمایەی ژیانی بوە.

جگە لەمانە کە تێکڕا بیست و هەشت هەزار هەڵبەستن، دیوانە جوانەکەشی پڕە لە قەسیدە، و غەزەل، و قیتعە، و چوارین و شتی تر.

نیزامی خۆی کوردایەتی خۆی لەم باسەدا دەردەخات:

لە (لەیلی و مەجنون)دا (لاپەڕە 87-89 چاپی مۆسکۆ) باسێکی باوانی کۆن دەگێڕێتەوە، هەر لە باوکە "ئادەم"ەوە تا سەر باوکی خۆی و بۆمان دەردەخا کە لەبەرئەوەی میهر و بەزەیی باوکێتی نەچێشتوە ڕیشەی باوکێتی لە دڵ دەرهێناوە. بەڵام شانازی بەو دایکەوە دەکا کە خاتونێکی کوردە و پاش مردنی دەڵێ:

"گەر دایکم، ئەو سەرەك خاتونە کوردە.. کە دایکانە لە بەردەممدا دەمرد.. لە کاتی لاواندنەوەدا کێ بێنمەوە یاد.. کە ئەو بهێنێتەوە بەردەمم بە زایەڵەو فەریاد" فارسیەکەشی بەم جۆرەیە:

گر مادر من رئیسه کرد
مادر صفتانه پیش من مرد
از لابەگری کرا کنم یاد
تا پیش من آردش بفریاد

نیزامی ساڵی (599ك-1202ز) لە تەمەنی (63) ساڵیدا لە گەنجە کۆچی دوایی کردوە.

لەم ساڵانەی دواییەدا لە شاری باکۆی ئازەربایجان پەیکەرێکی بۆ دروستکراوە، و زانکۆیەکی بە ناوەوە ناونراوە، هەروا لە تارانیش پەیکەرێکی بۆ کراوە و دیوانی کتێبخانەی گەورەی زانکۆش بە ناوی ئەوەوەیە، تا ئێستە زۆر جار یادی لێ کراوەتەوە.

بۆ ئەم سەرگوزەشتە تەماشای ئەم سەرچاوانە کراوە:

فەرهەنگی دێهخودا، فەرهەنگی موعین، فەرهەنگی عەمید، (تەئریخ ئەدەبیاتی ئیران)ی دکتۆر ئەدوارد براون، و زۆر سیپارەی تر.

سەرنج: لە شاری کفری کابرایەك هەبوو بە شەو لە قاوەخانەکان شانامەی دەخوێندەوە ناوی "شێخ جەبار" بوو ئەم کابرایە "خەمسەی نیزامی" بە هەڵبەست وەردەگێڕایە شێوەی گۆرانی کوردی و بە شەو لە قاوەخانەکان دەیخوێندەوە، و ئەشێ ڕوونووسی لای منداڵەکانی مابێ.

سالحیە:[xxvii]

گەڕەکێکی گەورە و بەناوبانگە لە (دیمەشق)دا، زۆربەی دانیشتوانی کوردن.

حافز:[xxviii]

(726ك-791ك).

خەواجە شەمسەدین محەمەد کوڕی بەهائەدین شیرازی لە بنەڕەتا خەڵقی مەلایری لوڕستان بوون، و چوبوونە شیراز، و لای ئەتابەگەکان ڕێزیان هەبوو. گەرچی بەهائەدین لە سەرەتادا زۆر دەوڵەمەند بوو، بەڵام پاشان هەژار کەوت و بە دەس تەنگی حافزی پێگەیاند. حافزی بلیمەت لەبەرئەوەی قورئان و سەدهەزار حەدیسی لەبەربوو، نازناوی "حافزی" هەبوو. لەگەڵ ئەمیرانی (ئینجو) و (ئال موزەفەر) هاودەم بوو، هەڵبەستی زۆری دەربارەیان هەیە. گۆڕی لە شیرازە و لەناو باغێکی زۆر شیرین و ڕەنگیندا نێژراوە.

سەعدی:[xxix]

(589ك-691ك).

مشرفەدین موسلح کوڕی عەبدوڵڵا، لە بنەماڵەیەکی زانستی ئاینی بوو. مەلای باش و نووسەری چاك بوو. حەزی لە گەشتوگوزار بوو. گوڵستان و بوستان و زۆر کتێبی تری هەیە. لە سەردەمی ئەتابەك ئەبوبەکری کوڕی سەعدی زەنگیدا، لە شیراز خانەقایەکی بۆ کرا، لەوێ بە دەرس وتنەوە و پەنددان خەریکبوو، و هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد و لە خانەقاکەیا نێژرا.

عارف ئەفەندی:[xxx]

ساڵی 1892 لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە. قورئان و ئەدەبی فارسی و خۆشنوسی لە حوجرەدا لە سلێمانی خوێندوە. لە (موسڵ)یش داخلی دەورەی ئاینی بوە. لە دواییدا لەگەڵ سوپای عوسمانی بە ڕوتبەی (بلوك ئەمینی- امین سریە) نێردراوە بۆ (ورمێ و مەراغەو خوی و سەڵماس)، لەو غەریبایەتیەوە شیعری لەسەر دوری و کەساسی و ژیانی پرمەینەتی سوپای عوسمانی و شەڕ ڕێك دەخست و دەینارد بۆ سلێمانی، تاکو شەڕ کۆتایی هات ئەوسا خۆشی گەڕایەوە. لە کاتی فەرمانڕەوایی شێخ مەحمودا عارف سائیب یەکێك بو لە گەنجە تێگەیشتوە پێشکەوتنخوازەکان، بۆیە شێخ کردی بە سکرتێری تایبەتی خۆی. هەر لەم کاتەشدا بوو کە نوسین و شیعر و قسەی خۆشی لە ڕۆژنامەشدا بڵاودەکردەوە.

عارف لە شەوی 16ی مانگی مایسی ساڵی 1923، لە دێی (قەرەچەتان) کوژراو هەر لەوێش شاردرایەوە*.

*سەیری کتێبی (لە خەوما)ی جەمیل سائیب کرا بۆ نووسینی ئەم سەرگوزشتە (بەغدا 1975- پێشکەشکردن و لێکۆڵینەوەی جەمال بابان).

# ئەمین فەیزی*

لە تورکیی عوسمانییەوە وەرگێڕانی: شێرزاد کەریم
ئامادەکردنەوەی: سدیق سالح

خەڵکی شاری "سلێمانی"ی سەر بە ویلایەتی مووسڵە. ساڵی 1299 ڕۆمی[1] بڕونامەی بە پلەی مولازمی یەکەم لە قوتابخانەی تۆپچیی ئەستەمووڵ بەدەست هێناوە. چەند ساڵێك لە قوتابخانە عەسکەرییەکاندا، مامۆستاو بەڕێوەبەر بووە و ژمارەیەکی زۆر ئەفسەر و فەرمانبەری لێهاتوو و توانای پێگەیاندووە.

پاشان پلەکەی بەرز بووەتەوەو، بووە بە فەرمانەدەی فەوج و لیواو لەگەڵێك دیوانی جەنگ و کۆمسیۆندا کاری کردووە.


سەرای سلێمانی

لەو دیوانی جەنگەیشدا کە بۆ چەتەکان پێکهێنرابوو، سەرۆکی حوکمی عورفی بووە. ئەم هەموو کارانەی زۆر سەرکەوتوویی ڕاپەڕاندووە. زۆر ئیشی بەکەڵکی لە دائیرەکانی دارایی و تەندروستی و پەروەردەو شارەوانی سەر بە هەردوو ویلایەتی مووسڵ و بەغدادا کردووە. بە داخەوە لە سەردەمی حوکمی ملهوڕی (استبداد)[2]دا، کاتێك هاوڕێکانی پلەیان بەرزئەکرایەوە ئەم بەشی تەنیا بریتی بوو لە مەدالیا و نیشانە.

ساڵی 1320 ڕۆمی[3]، بە مەبەستی حەجکردن، لە ڕێگای چوونە حیجازدا سەری لە هیندستان داوە. پاش ئەوەی لە حەج گەڕاوەتەوە، چووە بۆ سووریاو، لەوێوە هاتووەتەوە بۆ بەغدا. وەختێك بە پلەی میرئالای (میرلیوا) فەرماندەی لیوای (35)ی تۆپخانەی بیابان بووە، خانەنشین کراوەو، چووە بۆ ڤیەنناو پاریس، ئەگەرچی پێشتر دنیای ئەورووپایشی دیبوو.

کە یەکەمین جەنگی جیهانی دەستی پێکردووە، بە ڕێگای (مارسیلیا)دا گەڕاوەتەوە. دوا ڕۆژەکانی جەنگ، بە داگیرکرانی بەغدا، لە مووسڵەوە چووە بۆ ئەستەمووڵ. ژووری خانێکی لە (ئۆسکۆدار) بەکرێ گرتووەو، بە مووچەی کەمی خانەنشینیەکەی ژیاوە. لەبەرئەوەی زۆر بیری لە ژیانی ڕابردوو و ئەوکاتەی کردووەتەوە، تووشی نەخۆشیی ئیفلیجیی بووەو، لە نەخۆشخانە کەوتووە. چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، لەو مێژووەدا بووە.

بە نەخۆشیش لە پێناوی مەعاریفدا خۆی بەخت کردووە، بە تایبەتی لە بوارەکانی بیرکاری (ڕیازیات) و ئەدەبیات و زانستەکانی فەلسەفە و هونەری جۆراوجۆردا، بۆ سوودی خەڵك دوانەکەوتووەو، جێی ستایشە. شاکار و بڵاوکراوەکانی لە لایەن دوو کۆمەڵەی زانستییەوە لە پاریس جێی ڕێز و بەرز هەڵسەنگاندن بوون و، بە داوا و تکایەکی زۆر ئەندامێتیی ئەو دوو کۆمەڵەیەی قبوول کردووە. دیپلۆم و مەدالیەکانی هەردوو کۆمەڵەکە، تا ئێستایش ماون. ژیاننامەکەی لە گۆڤاری (ئینتەرناسیۆنال)دا کە 30 حوزەیرانی 1922 لە پاریس دەرچووە، بە وێنەوە بڵاوکراوەتەوە. دەرکەوتنی کەسێکی وا لە کۆمەڵگادا، جێگای ڕێز و پێزانینە.

کاره بڵاوکراوەکانی دانەر:

1-هوای نسیمی: حاڵ و باری فەلسەفی و کیمیایی هەوا دەرئەخات.

2-اجمال نتایج: بیرەوەریی پوختەی 10 هونەرە.

3-شعاعات: شیعرەکانی دانەری لە دووتوێدایە.

4-تفرفهٔ ریاضیه: هەندێ ڕێو شوێنی بەرزی زانستی جەبر.

5-انجمن ادیبان: شاکاری پانزە شاعیری کوردی هەڵبژاردەی تێدایە.

کۆمەڵێك کاری تری هەن، هێشتا لە چاپ نەدراون.

خاوەنەکانی چاپخانەی (نجم استقبال)

ئەحمەد حەمدی محەمەد جەمال

* * *

(1)1299 ڕۆمی: 1883 ز.

(2)واتە سەردەمی حوکمی سوڵتانەکانی عوسمانی و، بە تایبەت پێش مەشرووتییەتی 1908.

(3)1320 ڕۆمی: 1904ز.

**سەرنج:**

ئەم ژیاننامەیەی ئەمین فەیزی، لەم کتێبەیەوە وەرگیراوە: (علم و اراده، مادیون مذهبنك ردینی محتویدر، 1343) کە ساڵی 1927 بە ناوی ئەمین فەیزی میرئالآی تۆپچیی خانەنشینی خەڵکی سلێمانی (مؤلفی طوپچی میرالایلغندن متقاعد سلیمانیەلی امین فیضی)یەوە لە چاپخانەی (نجم استقبال)ی ئەستەموول چاپکراوە. ئەم دانەیەی لای ئێمە کە ئێستا لە کتێبخانەی تایبەتی کاکە ڕەفیقمە، پێشتر لەلای کاك حەمەبۆر مستەفا بووە. ئەمین فەیزی بە دەستخەتی خۆی لێی نووسیوە و پێشکەشی یەکێکی کردووە، بە داخەوە ناوەکەی ڕەشکراوەتەوە. سەر بەرگی ناوەوەی، ئەم چەند زانیارییەی بە عەرەبی لە بارەی ئەمین فەیزییەوە لێ نووسراوە کە بە دەق ئەمانەن: "كان امين فيضى بك اميرالاي في الموصل متقاعد و سافر الى استانبول يوم الخميس 4 جماد الثاني 1332 هـ (30 نيسان 1914). ثم عاد للموصل بعد سياحة في.."، "سافر مرة ثانية الى استانبول و توفى هناك"

2-(نجم استقبال) ئەو چاپخانەیەیە کە گۆڤارەکانی "ژین" و "کردستان"ی ئەستەمووڵی پێ لە چاپدراون. وەك ئەم کتێبەی ئەمین فەیزی ڕوونی کردووەتەوە، ساڵی 1927 (ئەحمەد حەمدی و محەمەد جەمال) ناوان خاوەنی بوون. جا ئیتر نازانرێ ئاخۆ ئەوانە کێن و، پێشتریش هەر هی ئەوان بووە یان نا؟

# لێهاتوویی پیشەسازی و زانستیی کوردانی بابان*

ئەمین فەیزی

زۆر پیشەسازیی بە کەڵك لەناو کوردانی باباندا هەبووە کە پێویستیەکانی ناوخۆی دابین کردووە. بەڵام ئەو پیشەیەیان کە بە ڕادەیەك لەوانی تر پێشکەوتووتر بێ، چەخماخسازی (چەك دروستکردن)یە. ئەمەوێ بڵێم: کوردی بابان، نەك هەر لە چەك بەکارهێناندا، بەڵکە لە دروستکردنیشیدا، بەهرەو دەست ڕەنگینییەکی باشی هەبوە. ئەکرێ بوترێ: حکوومەتی بابان لە هەنگاوێکیدا تۆپخانەیەکی بە پلەیەکی تەواو و بە پێی ئەوکاتە دامەزراندووە. ئەو چەکە قورسانەی کە هێنانیان لە ئەستەمووڵەوە زەحمەت بووبێ، لە سلێمانی خۆی و بە زانیاریی وەستاکانی ناوخۆ دروست کراون. تۆپێکی دەستکردی ناوخۆ تا ئەم دواییەیش مابوو، لە ڕۆژانی ڕەسمیدا بەکارئەهێنرا.

پێش پەیدابوونی ئەو چەکە ئاگردارانە، لە دواوە پڕئەکرانەوە. تفەنگ و دەمانچە بەکارهێنراوەکان لە ئەوروپا، هەرە باشترینیان لە سلێمانی دروست ئەکران. سەرباری ئەوە، دروستکردنی ئەو تفەنگانە کە لە دواوە دائەگیرێنەوە، لەم ئاخروئۆخریەدا بە ماوەیەکی زۆر کورت چووە ڕیزی ئەوانی تر. سلێمانی سەرەڕای ئەوەی کە شارۆچکەیەك بوو، مانگی (200-300) تفەنگی جۆری (هانۆری مارتینی)ی لێ دروست ئەکرا.

تفەنگ و جبەخانەی عوسمانییەکان کە لە شەڕی ساڵی (93)[1]دا کەوتبوونە دەستی ڕووسەکان، لە ڕێگای ئێرانەوە هێنرانە سنجاقی سلێمانی. ئەوانە، خێڵەکان و هەندێ لایەنی تر بەکاریان ئەهێنان.

هۆیەکی ئەم سەرقاڵبوونەی خەڵك بە چەك دروستکردنەوە، ئەوەبوو کە حکوومەت نەیئەتوانی ئاسایش دابین بکات. بۆیە هەریەکە بە پێویستی ئەزانی، بۆ پاراستنی ماڵ و گیانی خۆی، چەکی خۆیی هەبێ. شارۆچکەیەکی وا پچووکی دور لەو ناوەندە پیشەسازیانەی کە یاریدەدەر و هاندەری سەرخستنی هونەری چەکسازین، بێگومان دانیشتوانەکەی لێوەشاوەییەکی جەنگی و خولیای عەسکەرییان ئەبێ.

ئاشکرایە کە قوتابخانەیەکی ئامادەیی عەسکەری بۆ پێگەیاندنی ئەفسەر بۆ سوپای شەشەمی کۆنی بەغدا دامەزرێنرا، بە تەنیا سلێمانی، لەناو سێ ویلایەتی سەر بەو سوپا ناوبراوەدا، قوتابیی بۆ ئەو قوتابخانەیە ئەنارد. چەند ساڵێك بەو شێوەیە تێپەڕی. واتە زۆربەی قوتابیانی ئامادەییەکە، دیارە بە پێی ڕێژەی دانیشتوان، بەغدایی، بەشە کەمەکەیشی خەڵکی سلێمانی بوون

بەڵام قوتابییانی سلێمانی زۆریان بە تەواوی و باشی ئەیانخوێندو ڕەوشتێکی خاوێن و بێگەردیان ئەخستە ڕوو. ئەوی لەمە ئاگادار بوو، خوالێخۆشبوو موشیر زەکی پاشای وەزیری قوتابخانە عەسکەریەکان بوو. لەو کەسانە کە لێوەشاوەیی‌ی زانستی و عەسکەریی قوتابیانی سلێمانیی نرخاند بوو.

ئەوەندەی ئەفسەرو فەرماندەی عەرەبی لە عێراق پێگەیاندبوو، ئەوەندە و بگرە زیاتریش ئەفسەر و فەرماندەی کورد، هەم بۆ ئەسڵی مەبەست و، هەم لەبەر هەندێ هۆی سیاسی بە پێویست زانرابوون و پێگەیەنرابوون. بەوپێیە، ئەگەرچی ڕوشدیەی مولکی لە ناوەندی زۆر ویلایەتی ترو، بەتایبەتی لە سلێمانی هەبوو، پێویستیی دامەزراندنی ڕوشدیەیەکی عەسکەریشی دەستبەجێ عەرزی پاشا کردو، ئیرادەی بۆ بەدەست هێنا. نابێ لەم لایەنەوە نکوولی لە هیممەت و هاوکاریی "فەریق ڕەزا پاشا"ی وەزیری دووەم بکرێ.

ئەوەتا بە سایەی ئەو جووتە قوتابخانەیەی ڕووشدیەی عەسکەریەو ڕوشدیەی مولکیی لەوەوبەریشەوە، گەلێ ئەفسەر و فەرماندەی توانا لە خەڵکی سلێمانی پێگەیشتن. بەم حاڵ و بارەوە، زۆر ئەفسەر و فەرماندەی پێشکەوتوو و مەرد لە سوپای عوسمانی ئەرکانەکانی جەنگ و پێڕە جۆراوجۆرەکاندا هەن.

کوردانی بابان بەو ڕادەیە کە ئامادەیی‌ی خۆیانیان لە بواری پایەبەرزی عەسکەریدا پیشان داوە، توانیویانە لە زانست و هونەریشدا لێهاتوویی‌ی خۆیان دەربخەن. ئەوانەی کە ئەم ڕۆژانەی دوایی بەغدایان بە زانستەکانیان زیندووکردۆتەوە، هەموویان پیاوماقووڵی سلێمانین. هەرە گەورەترین خانەدانانی زانست، خەڵکانی سلێمانی پێکیانهێناوە. زەهاوی زادەکان و حەیدەری زادەکان، هەموویان لە سلێمانی یا لە ناوچەکانی دەوروبەری خوێندنیان تەواوکردووە.

ناکۆکیی مەزهەبی نەکەوتووەتە ناو سنجاقی سلێمانی. ئەمەیش لە ئارەزووی زانست و، بەو هۆیەشەوە، لە زیادبوونی ژمارەی زانایانەوە پەیدابووە. جێی سەرنجە کە زانایانی پیاوماقووڵ یا شێخێکی تەواو لە هەر دێیەکی "سلێمانی"دا هەبوە.

حەزرەتی "زیائوددین مەولانا خالید"ی شێخی پایەبڵندی تەریقەتی بەرزی نەقشبەندی، بەشێکی خوێندنیی لە دێهات تەواوکردووە. خوێندنی زانست، لە ڕۆژانی حکوومەتی باباندا، قورسایی‌ی لەسەر حکوومەت نەبوە. دانیشتوانی هەر گەڕەك و هەر دێیەك کەم و زۆر، بەڕێوەبردن و بەخێوکردنی قوتابییانی زانستی ناو مزگەوتەکانیان خستبوە ئەستۆی خۆیان و، چ پەیمانێکیان لەو بارەیەوە دابوو، زۆر بە تەواوی و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بەجێیان ئەهێنا.

"ئێستا هەریەکە لە دۆخەکانی جارانت بووە بە خەو و خەیال"[1]

شارستانێتیی ئێستا بووەتە مێردەزمەیەك و، ئەو نموونانەی بەختەوەریی قووتداوە و بڕاندوونیەتەوە. ئەو نەریتە جوانانە کە لە حوکمە بەرزەکانی دینەوە پەیدا بوون، لەگەڵ کردەوە و دابە نەتەوەییەکاندا، پێکەوە لەناوچوون و بوونە خۆڵی دەم با. پاشەڕۆژ نەریتەکانی ڕۆژاوا جێگیر ئەبن، ئەو نەریتانە کە لای خودی ڕۆژاواییەکانیش جێی سکاڵالێکردنن.

ڕەحمەتی حەزرەتی شێخ ڕەزای سەرامەدی شیعر، خەم و داخی خۆیی بەرامبەر بەم دۆخەی دوایی‌ی ڕۆژانی حوکمداریی بابان بە شیعرێك پیشان داوە. بە نووسینەوەی ئەم شیعرەی ناوبراو، دوایی بە وتارەکەم ئەهێنم:

**ئالی بابان[2]**

**لە فیکرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو**
**نە مەحکوومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی ساسان بوو**
**لەبەر قاپیی سەرا صەفیان دەبەست شێخ و مەلاو زاهید**
**مەطافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو**
**لەبەر طابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا**
**صەدای مۆزیقەو و نەقارە تا ئەیوانی کەیوان بوو**
**درێغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عومرە، ئەو ڕۆژە**
**کە مەیدانی جریتبازی لە دەشتی کانی ئاسکان بوو**
**بە ضەربەو حەملەیێ بەغدایی تەسخیر کرد و تێی هەڵدا**
**سلێمانی زەمان، ڕاستت دەوێ، باوکی سلێمان بوو**
**عەرەب ئینکاری فەضلی ئێوە ناکەم، ئەفضەلن ئەمما**
**صەلاحەددین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو**
**قبووری پڕ لە نووری ئالی بابان پڕ لە ڕەحمەت بێ**
**کە بارانی کەفی ئیحسانییان وەك ئەبری نیسان بوو**
**کە عەبدوڵلا پاشا لەشکری والیی سنەی شڕکرد**
**ڕەضا ئەو وەقتە عومری پێنج و شەش طفیلی دەبستان بوو**

***

(1)93: واتە ساڵی 1293 ڕۆمی کە ئەکاتە 1887. مەبەستی پێ شەڕی نێوان ڕووس و دەوڵەتی عوسمانییە.

(2)ئەم شیعرە چەند جیاوازییەکی لەگەڵ دەقی ڕاستەقینەیدا هەیە.

سەرچاوە: گۆڤاری "ژین"، ئەستەموول، ژ 25، 2 تشرینی یەکەمی 1335 ڕۆمی (1919).

لە کتێبی: م. ئەمین بۆز ئەرسلان، ژین کۆڤارا کوردی- ترکی 1918-1919.

جلد 5، ئۆپسالا، 1988.

# لێوەشاوەیی‌ی جەنگیی کوردانی بابان*

فەیزی

بازووی بەهیممەتی هەریەکە لە کوردانی بابان گورزێکی ئازایەتی و، سنگی مەردایەتیی هەریەکەیشیان سوپەرێکی باڵادەستییە. ئەمانە، یەکێکی ئەو نەتەوە نەجیبانەن کە لەهەر شەڕێکدا بووبن، دریغیان لە ئازایەتی و غیرەت نەکردووە. ئەشێ بوترێ: سلێمانی و ناوچە پێوەبەستراوەکانی ژێر باڵی حوکمداریی پاشاکانی بابان، لە شەشسەد ساڵ لەمەوبەرەوە بەبێ کۆڵدان وەکوو قەڵایەکی قایم بوون بەرامبەر بە هێرشەکانی ڕۆژهەڵات.

ئەوی لە سەرکەوتنی "چاڵدێران"ی سوڵتان سەلیمی یەکەم و بە تایبەتی لە سەندنەوەو داگیرکردنەوەی بەغدادا بە دەستی سوڵتان موڕادی چوارەم، خۆی بۆ پاراستنی شەرەف و شکۆمەندی بەخت کردبێ، خەڵکی سلێمانی واتە کوردانی بابان بوون. ئەم هەموو بەرزی و ئازایەتیە، لە گەوهەری موسڵمانێتی و کوردایەتییەوەیە. سەربازانی هەڵبژاردەی ئۆردووی شەشەمی کۆن، ئەم چەرخەی دوایی، بریتی بوون لە ڕۆڵەکانی خەڵکی سلێمانی. ئەوان بوون کە لە دامرکاندنەوەی یاخیبوونەکانی (نەجد) و (مونتەفیك)دا، زیاتر و چەندین جار لە چەتەکانیان داوە و لەناویان بردوون.

ئەمانەوێ بڵێین: ئەگەرچی سلێمانی لە ناوەندی بایەخ پێدان چۆڵ و لە هەموو ڕوویەکەوە بەشخوراو بووە، کەچی هەمیشە لە پەیمان و وەفاداریدا خۆڕاگر بووە و لە سەلماندنی دۆستایەتیشدا بەرامبەر بە دەرگای خەلافەت دوانەکەتووە. بەڵام پاداشتەکەی چی بووە؟ هیچ. سەرەڕای ئەوە، هەر خەڵکی سلێمانی بووە کە تاڵاوی زۆرداریی چەشتووە و ماڵی تاڵان کراوە و لە حاڵ و باری نەپرسراوەتەوە.

والی و فەرماندەکانی ڕۆژگاری نائاسایی‌ی بەغدا، ئەوە لەولاوە بوەستێ کە بە هیچ جۆرێك دەستبەرداری عەسکەری سلێمانی نەبوون، هەردەم و لە کاتی نائاساییدا سوودیان لە لێوەشاوەیی‌ی جەنگی و ئامادەیی‌یان وەرگرتووە.

گەورەترین و گرنگترین خزمەتێك کە پێشکەشی کوردانی بابان کرابێ، لە کاتە نائاساییەکاندا بووە، چونکە هی وایان لە ناودا بووە کەم و زۆر بایەخی بە ئازایەتی و کردەوەکانیان داوە. ئەگەر حکوومەتی بابان لەسەر حاڵی پێشووی بهێڵرایەتەوە، ئەبوە پاڵپشت و، پلەی یەکێك لە حکوومەتە هاوپەیمانە پێکهێنراوەکانی ئەڵمانیای ئەبوو.

ئەبێ بزانین کوردانی بابان تا چ ڕادەیەك ئامادەیی عەسکەرییان هەبوە. پاشاکانی بابان پێش هاتنە مەیدانی ڕژێمی تازەی حکوومەتی عوسمانی‌و، بگرە زۆر پێشتریش، بیریان لە مەسەلەی پێگەیاندنی سوپای نیزامی کردووەتەوە. ئەحمەد پاشا، لیواو فەوجی بۆ هەریەکە لە لقە عەسکەریە جیاجیاکان پێکهێناوەو، بەوپێیە سوپایەکی بەهێزی دامەزراندووە.

ئاستی پێشکەوتنی ئەو ئاوەدانکردنەوەیەی جاران کە لە سایەی حکوومەتی ناوچەیی‌ی سلێمانیدا بەدی‌هات، خاڵێکی


مزگەوتی گەورەی سلێمانی

شایانی سەرنجدانە. ئەوکاتانە سوود لە موڵکی ئاغاو بەگەکان وەرگیراوەو بە تەواوی خراونەتە ژێردەست. وەکوو ئەڵێن: توانیویە ژیان و بەڕێوەبردنی هێزێکی عەسکەریش دابین بکات. جگە لەوە، لە زیادەی داهاتەکە و بە حیسابی پێنج هەزار قرۆشی رۆژانە، ساڵانە برە پارەیەکی گرنگی لێ نێردراوە بۆ بەغدا.

دوایی چی بوو؟! دوایی بۆ لەناوبردنی خانەدانەکان و مراندنی ئیدارەکە، پاشاکانی بە دەستوورێك لەگەڵ لایەنی گومانلێکراودا لە جێی خۆیان لابران و کرانە والیی ئەو ویلایەتانە کە پێیان بێگانە بوون، بەوە کۆتایی بە حکوومەتەکەیان هێنرا. بەڵام ئەو پاشا ناوبراوانە کە کرابوونە والی لە ویلایەتە گرنگەکانی وەکوو حەڵەب و یەمەن و بەسرە، لە کار و کۆشش ساردنەبوونەوەو، کاری گەورە گەورەیان لەو ویلایەتانەدا جێبەجێ کرد و تا رۆژی مردنیان چاکی و راستگۆییی خۆیان پاراست.

ئیتر سلێمانی، دوای ئەوان، بە سایەی چەندین ئیدارەی لە بنەڕەتدا نەخۆشەوە بە پلەی یەکەم لە ئاوەدانکردنەوەدا دواکەوت، بە جۆرێك کە بودجەکەی بەشی بەخێوکردنی فەوجێکی ناتەواوی نەئەکرد و کەوتە هەلومەرجێکیشەوە کە تەنانەت مووچەی فەرمانبەرانی ناوچەکەی پێ نەئەدرا. دێهاتەکان کاول بوون و خەڵکەکەیشیان، هەندێکی مردن و هەندێکی رووپانکردە ئێران. لەبەرئەوەی کە ئەم باسانە زۆر جەرگبڕن، درێژەپێدانیان لەمە زیاتر بە پێویست نازانم.

سەرەنجام، بیرو تەگبیری دروستی تایبەت بە سوودوەرگرتن لە لێوەشاوەییی جەنگیی پیاوانی بابان، بە راستی شایستەی سەرسوڕمانە. ئەحمەد پاشا، وەك ئەخۆشخانە و سەربازگە و دەبۆی بۆ لقەکانی تۆپ و قایمکاری و پیادە و سوارە دروست کردبوو، بەشێکی زۆری پێویستیە عەسکەریەکانیشی لە بەرهەمی دروستکراوی خۆماڵی دابین و ئامادە کردبوو. لیواو فەوجەکان، کاتێك پۆل پۆل مەشقیان ئەکرد و بە کۆمەڵ خۆیانیان پیشان ئەدا، خەڵك لە رادەبەدەر خۆشحاڵ ئەبوون.

تەنانەت رەحمەتی "نالی" ئەفەندیی شاعیریش کە شەیدای ئەو دیمەنە گیانپەروەرەی سوپاکە بووبوو، هەستی شاعیرانەی بەرامبەر بەو نیزامە عەسکەریەی پاشا جۆشی سەندبوو و کەوتبوە شیعردانان. منیش لێرەدا بەو شیعرەی کە بۆ رێکوپێکیی بێئەندازەی ئەو تەشکیلاتە وتوویە، کۆتایی بە قسەکانم ئەهێنم:

**ئەو طاقمە مومتازە:**

**ئەو طاقمە مومتازە کەوا خاصەیی شاهن**
**ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن**
**یەکصەف کە دەوەستن، بە نەظەر خەطی شوعاعن**
**حەلقە کە دەبەستن، وەکوو خەرمانەیی ماهن**
**نەرگس نیگەهـ و ساق سەمەن و کورتە وەنەوشەن**
**موو سونبول و روومەت گوڵ و، هەم لالە کولاهن**
**گوڵزاری دەرو دەشتن و، غیلمانی بەهەشتن**
**ئاهوو صەف و ئاتەش بە کەف و تیز نیگاهن**
**صەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن**
**قامەت شەجەر و مەظهەری ئەلطافی ئیلاهن**
**گەهـ طاوس و گەهـ کەبکن و، گەهـ بۆقەلەمونن**
**گەهـ ئاتەش و گەهـ شوعلەوو گەهـ دوودو سیاهن**
**لایەق بە بەدەن ئەطلەس و ئەخضەر کە دەپۆشن**
**ئەوڕەستە گوڵ و بەستە لەگەڵ دەستەگیاهن**
**بۆ سەیر و خەرامیدەنی ئەو سەرووقەدانە**
**صۆفی لە طەڵەبدان و و هەموو سالیکی راهن**

* *

سەرچاوە: گۆڤاری "ژین"، ژ 23، 28 ئاغستۆسی 1335 رۆمی (1919) لە کتێبی: م. ئەمین بۆزئەرسلان، ژین کۆڤارا کوردی- ترکی 1918- 1919، جلدە، ئۆپسالا، 1988.

---

# دوو صنف چوونە بەغدامان بۆ مەکتەب

## چەند لاپەڕەیەکی "بەسەرهاتووی کاکە رەشید شەوقی"*

رۆژێ لە ناکاو ئەمرێك هات بۆ مودیری مەکتەبی (رِوشدیەی عەسکەریی سلێمانی/ س.) کە پێویستە لەناو هەفتەیەکدا زوو بە زوو صنفی سێ ئیمتیحان بکرێن و لەگەڵ صنفی یەکی ئەعدادی بە کۆمەڵ و لەژێر چاودێریی ضابطیکدا بنێررێن بۆ بەغدا بۆ مەکتەبی ئەعدادیی عەسکەریی ئەوێ. ئیتر هەرچۆنێك بوو ئیمتیحان کراین و بۆ چوونە بەغداد دەستکرا بە خۆئامادەکردن.

بە دوانزە رۆژ بە رەزالەتی کاروان کە گەیشتینە بەغدا، چووینە خانێکەوە؛ ژوور ژوور دامەزراین و بۆ بەیانی زابت نووری وەیس ناو کە لە تەکمان هاتبوو، بردینی بۆ مەکتەب. مودیری مەکتەبەکەی بەغدا بیکباشی عەبدوللەطیف ئاگاهـ پاشا ناو، بەغدایی بوو، زۆر رقی لە کورد بوو. لەبەرئەوەی کە دواکەوین و شپرزەمان بکات، وتی: مەکتەب پڕ بۆتەوە لە قوتابی و جێگای ئێوە نابێتەوە. بچنەوە بۆ سلێمانی هەتا ساڵێکی دیکە، ئەنجا ئەتانهێنینەوە.

ئەودەمە ناظم پاشا ناو چەچانیك ئۆردوو قوماندانی و والیی بەغدا بوو[1] هەموو بە وردو گەورە بەیانی زوو چووین بۆ کۆشکەکەی لەوبەر لە کەناری دیجلە، بەڵام ئێشکچیەکان دووریان خستینەوەو چووین بۆ بن داری خورماکان، چاوەنواری

هاتنەدەرەوەی پاشای نامویارەك بووین کە خۆمان و عەرضوحاڵەکەمانی تەقدیم بکەین. گێژ بووین، پێمان شل بوو، هەر نەهاتە دەرەوە. تومەز دوو قەحبەی لەلا بوو، هەتا ئەو قەحبانە نەڕۆیشتن، نەهاتە دەرەوە.

کە هاتە دەرەوە لەگەڵ خۆی و یاوەرەکانی، ئەنجا هێرشمان بردە لای، عەرضوحاڵەکەمان دایە دەست یاوەرەکەی و چۆنێتیی خۆمانمان پێوتن کە مەغدوورییەتمان بپرسنەوە. یاوەر پێی‌وتین: بڕۆن سبەینێ وەرنەوە ئەم وەختە، یەکدوویێکتان وەڵام وەرگرن. بە نابەدڵ گەڕاینەوە بەرەو خان و بۆ نانخواردن هەر شەش



حەوتێکمان ڕوومانکردە چێشتخانەیەك و هاتینەوە بۆ خانەکە. ئیتر زۆر گەرمامان بوو، هەموو لاڵ و پاڵ لێی نوستین وەك مەڕی بێ شوان!

کە فێنك داهات، دەستمان کرد بە چوونە دەرەوە، هەندێکمان بەرەو شەقەکە و سەیری واپۆڕ[2] و بەلەم کردن و، هەندێکیش بەسەر جسردا بۆ ئەوبەر بۆ چایخانەکان بڵاوەمان لێکرد. شەو کە گەڕاینەوە، لە وردەکان هەندێك ڕێگای لێ ون ببوو، هەر نەهاتنەوە. چووین گەڕاین بە شوێنیانا، تا دۆزیمانتەوە زۆر هیلاك بووین. جا بۆ ئەوەی کە بەلەسە نەبین، بڕیارمان دا کە باوکی یەحیا عەبدولڕەحمان عەنبەر ناو کە هاتبوو لەتەك یەحیای کوڕی، ئەو بکەین بە شوانمان، ئەوەك جارێکی تر بەلەسە ببین و، هەرکەس بە هەوەسی خۆی بەملاو ئەولا نەچێت.

بۆ بەیانی من و ئەحمەد و مەجید و یەحیا، لەژێر چاودێری شوان ئەورەحمانی عەنبەردا چووینەوە بۆ کۆشکی پاشا بۆ چۆنێتی و، چووین هەمیسان ڕاوەستاینەوە هەتا تەشریفی ناشەریفی پاشا هاتە دەرێ و، لە بەردەمیا هەروەك عەسکەرێکی موطیع سەلامەمان بۆ کرد. هیچ ئەهەمیێتی نەدایێ و، هەروەك ورچ بە بۆڵەیەك بە یاوەرەکەی وت: (کندیلری اکلات طاغلرینه گیتسونلر تاکلەجك سنه! بە تورکی کە پێی وت، ئەویش عەرضوحاڵەکەی کە بۆ مەغدوورییەتمان نووسیبوومان بە ناوی 45 قوتابییەوە لە باخەڵی دەریهێناو دایەوە دەستمان. وتی: ها بیخوێننەوەو، یاڵڵا بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆتان.

کە تەماشای عەرضوحاڵەکەمان کرد، یاوەرەکە لە ژێریدا بە تورکی (بصرە قولیرە موجود اولدوغی مناسبتیلە و بو سنە مکتب ازدحام اولماسی طولایسیلە و دکتورلرك راپوری اوزرینەر قولیرە قورقوسندن ارتق هیچ برطلبە بو سنە قبول و مکتبە دخولی ممنوع اولدوغی بیاندر" نووسیویە. ماناکەی: لە بەصرە ڕشانەوە پەیدا بووەو، ئیمساڵیش لە مەکتەبی ئەدادیی عەسکەریی بەغداد زۆر قوتابی پڕ بووە. جا لەبەرئەمە دکتۆر ڕاپۆری داوە کە لەوەی هەیە زیاتر نابێ قوتابییەك داخڵی مەکتەب بکرێت ئیمساڵ لە ترسی ڕشانەوە! ئیتر بە پێی ئەو ڕاپۆرە پیسە ڕێکخراوە، بە تەواوی ناهومێد کراین. بە شپرزە و سەرلێشێواوی گەڕاینەوە لای هاوڕێ چاوەڕوانەکانی هاوبەخت.

وە کە لێمان کۆبوونەوەو تێمانگەیاندن، بە ئاهی ساردەوە ئەوانیش دڵگیر بوون و هەندێ لەوان لە داخانا ئاو بە چاویا ئەهاتە خوارەوە. ڕوومانکردە کاك ئەورەحمان و، وتمان: شوانەکەمان تەدبیر چییە؟ وتی: من ئەڵێم ئەگەڕێینەوە جارێ لەم بەغدایە، لە حکومەتا پیاوی کورد هەیە، بچین بۆ لایان؛ وەك یەکێك هەیە ئەیناسم، خەڵقی خۆمانە بیکباشیی[3] تۆپچی "ئەمین فەیضی"ی ناوە، بیدۆزینەوە و بچین بۆ لای، دەردی خۆمانی تێبگەیەنین، بزانین ئەو چە ڕێیەکمان پیشان ئەداو ئەڵێ چی. ئەنجا خۆم چی بڕیار بدەم بۆی تێئەکۆشین و، هەموو شتێك ئەگرمە خۆم. من ئەم مەغدوورییەتەی

ئەم دوو گەماڵە قوبووڵ ناکەم. ئەم هەموو قوتابیی خەڵقە بخوێنن و بێ بە پیاو و زابط و، بە ناحەق کوڕەکەی من قوبووڵ نەکرێ و بگەڕێتەوە. بۆ سبەیش بکرێت بە نەفەرێکی خۆی و باوك ڕەنج بە خەسار.

ئیتر لەسەر وتەی ئەوڕەحمان شوان، ماڵی ئەمین فەیضی بەگمان دۆزییەوە. بۆ عەسرێ چووین بۆ خزمەتی، حەوتمان لەتەك شوانەدا. زۆر حورمەتی گرتین و، لە پاشدا بەزەییەکی زۆری پیامانا هات کە تێمانگەیاند. ئەنجا وتی: ئەم ناظم پاشایە لە گەنجێتیدا کوردەکانی دەرسیم چاك تێیان هەڵداوە لەبەر بێ نامووسییەك! وە مودیریش عەبدوڵڵەطیف، خوشکەکەی زابتێکی کورد هێناویێتی. لەبەر بێناموسی، ئەو خوشکەی تەڵاق دراوە. ئەنجا حەق لە ئیچوەی بەستەزمان ئەکاتەوە. جا ئێستا من بۆ ئێوە سوورەتێکی تەلغرافتان بۆ ئەستانبووڵ بۆ وەزارەتی حەربییە بە تورکی بۆتان ڕێك ئەخەم. بچن بۆ تەلغرافخانە، لێیدەن، بزانن وەڵام چۆن ئەبێ. وەرنەوە خەبەرم بدەنێ. بە سوپاسەوە هەڵساین و چووین بۆ تەلغرافخانە بۆ لای مودیر. ئەو مودیری تەلە زۆر پیاوێکی باش بوو، بەزەیی پیامانا هات و تەلغرافەکەی بۆ لێداین. وتی: سبەی نا دوو سبەی وەرنەوە، بەڵکوو وەڵام دەست بکەوێت.

چووینەوە خان و، چۆنێتیمان لە هاوڕێکانمان گەیاند و، چاوەڕوانیمان کرد هەتا دوو سبەی. کە چووینەوە بۆ لای مودیر، پێی وتین: لە ناظم پرسرا، ئەویش وەڵامی وەزیری دایەوە: کە لەم وەختەدا غەیرە جائیزە ئێوە قوبووڵ بکرێن.

چووین بۆ لای ئەمین فەیضی بەگ، چۆنێتیمان پێوت. زۆر پێی ناخۆش بوو و دەستی کرد بە جنێودانی ناظم پاشاو مودیری مەکتەب. پێی وتین: ئەنجا تەلغرافێك بۆ ڕەئیس وزەرا با لێدەن، بزانین ئەمە چۆن ئەبێ. بۆی ڕێکخستین و چووین لێمان دا. ئەمەش لە پاش شەش ڕۆژ وەڵام درایەوە. ئەویش هەروەك پێشوو ناظم پاشای زاڵم تەگەرەی لێدا.

چووینەوە بۆ لای فەیضی بەگ، تێمانگەیاند. وتی: ئەی ڕۆڵە کوردەکان ئیتر یەك پەنای دیکە نەماوە. بەڵام یەك پەنای کەم بەخەیاڵدا هات. با ئەم پەنایەش تاقی بکەینەوە کە ئەویش وەلی عەهدی سەلطەنەت یووسف عیززەددینە. ئاخر تەلغرافێکیش بۆ ئەو لێبدەن بە جوابلی[4]. ئەمە ئاخر زارە ئەیهاوێژین و، بڕیار درا. کە موسوەدەی تەلغرافەکە گیرایەوە، سەیرمان کرد ئەو حەوتەمان کە چووینەتە خزمەتی، ئەو پارەی جوابلی تەلغرافەمان لێ

هەڵناسێت. ناچار پێمان وت، خۆی بۆی تەواوکردین لە کیسەی خۆی و، چووین لێمان داو، گەڕاینەوە خانەکە.

کە هاوڕێکانمان کۆکردەوە، پێمان وتن و، هەرکەس لەلای چەند قەرزی ئەم تەلغرافانەی لەسەرە کە ویستمان لێیان بستێنین، سەیر ئەکەین هەندێکیان جلقی[5] پێ نەماوەو، ناتوانن سەموونێکی وشك چییە بۆ خواردنی بیکڕێت، چە جای بتوانێ بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی.

جا هەروەك بە ناچاری پیتاکمان بۆ کردن، بەڵام بۆ گەڕانەوەمان کە لێکمان دایەوە ئەبێت هەندێکمان بە دوو کەس وڵاغێك بەکرێ بگرین و، بە نۆرە سواری ببین بۆ ئەو دوانزە ڕۆژە کە پێی بگەینەوە سولەیمانی. لەبەر ئەم فەلاکەتە باوکی یەحیا عەبدولڕەحمان شوانە وتی: وا بەهەر ڕەزالەتێك بوو چووینەوە بەڵام لەوێ پێمان ئەڵێن دەربیانکردن و، هەندێ پێمان وەك پێئەکەنن، ئیستقبالیش ڕۆێ! جا هەروەك پێشینان وتوویانە: بە شەرەفەوە ژیان و مردنی بە شەرەف پێویستە بۆ پیاوی مەرد. من خۆم و کوڕەکەم بڕیار ئەدەین کە بە شەرەفەوە بمرین. خۆم بۆ ناظم پاشاو، یەحیای کوڕیشم بۆ مودیری سەگباب، ئەیانکوژین. با بمانکوژنەوە، کە بە شەرەفەوە لەسەر حەق شەهید ببین. جا ئەی ڕۆڵانم ئێوە لەمەدا لەگەڵمانن یا نا؟ هەموو هەر حەوتمان وتمان: لە گەڵتانین، با بە شەرەفەوە بمرین و، دەرسێکیش بێ بۆ لەمەولا بۆ زاڵمان. ئیتر لە پاش ئەوەی کە وەڵامی مەئیووسییەتی دواییمان وەرگرتەوە، هەرچ شتێکمان کەلوپەل هەمانە، بیفرۆشین و، بەوە خەنجەر و دەمانچە دووی لێ بکڕین و، وردەڵان بنێرینەوە و خەبەر بدەین بە دایك و باوکیان بێن بە شوێنیانا. ئەنجا هەر نۆمان، پێنجمان لەگەڵ شوان بۆ ناظم پاشاو، چواریشمان بۆ مودیری مەکتەب بە ئیستیدعایەکی درۆزنە و پاڕانەوە خۆمانیان نزیك بخەینەوە، لەو وەختەی کە لە ماڵ دێنە دەرەوە بەرەو دائیرەیان، بە دەمانچەو خەنجەر دایانپلۆسین. ئیتر چی ئەبێ، ببێت!

لە پاش ئەم بڕیارە پێی وتین شوان: ئەڵێن شتێکی زۆر سەیر هاتووە بۆ بەغدا، سینەمای بێدەنگە. با ئیمشەو بە دزیی وردەڵان هەر نۆمان بچین بۆ سەیرکردنی، هەتا دنیامان لێ بەسەرنەچوە. بڕیاردراو، بۆ شەوێ بە دزییەوە چووین و دیمان، زۆر لامان سەیربوو.

ساعاتێك بەسەرچوو، سەیرمان کرد ئەوا ئینضیباطو زابتی مەکتەب و فەڕاش بە پەلە هاتنە ژوورەوە و بە پەلە هەڵیانساندین



و بردیانین بۆ لای مەکتەب و، پێیان وتین: موژدەبێ، هەمووتان قوبوولْ کران بە ئەمری وەلی عەهد و بەبێ موعایەنە. وە کە چووینە بەردەرکی مەکتەب، سەیرمان کرد هاوڕێکانی تریشمان هێنراون و، ئەنجا هەموو بە کۆمەڵ براینە ژوورەوە و ناومان نووسراو جێگا و ڕێگامان بۆ تەرخان کراو، ئەنجا بە پەلە زابطی داخلی چوو بۆ دائیرەی تەلغرافخانە خەبەری دا بە ناظم پاشاو مودیری مەکتەب کە هەموو داخڵ کراین بەبێ کەمی. وە جواب درایەوە بە وەلی عەهد یووسف عیززەددینی خوالێخۆشبوو.

گێڕانەوە: هەر کە تەلغرافەکەمان ئەگاتە دەست وەلی عەهد یووسف عیززەددین، زۆر ڕقی لەو کردە بێمەعنایە هەڵئەسێ و، بە نەفسی خۆی دێتە سەر ماکینەی تەلغراف و، ناظم و مودیری سەگباب بانگ ئەکاتە سەر تەلغرافخانەو لە پاش سوئالکردن پێیان ئەڵێت: هەر ئێستا لە قوتابییەکانی بەغدایی چلوپێنج کەسیان بنێرنەوە بۆ لای کەسوکار و ماڵی خۆیان و چاوەڕوانی ساڵێکی تر بکەن و، ئەو چلوپێنج قوتابییە کوردانە لە جێیان دابنێن بەبێ موعایەنەو، هەتا ئەمە ئەکرێت نە من و نە ئێوە ئەبێت دائیرەی تەلغراف بەجێ نەهێڵین.

وە کە ئێمە داخڵ بووین هیچ قوتابییەك دەرنەکرا. تومەز ئەو پیلانە بۆ ئێمە ڕێکخرابوو. بەلاّم لەسەر ئەوەی کە مووەفەق بووین، مودیر ڕقی لێهەڵگرتین. هەروەك لە ئیمتیحانەکاندا نمرۆی کەمی ئەداینێ، بە قوتابییە عەرەبەکان ئەیداین بە شەڕ و حەپسی ئەکردین. وە لە ئاخریدا سێ لاوی باشی لێ دەرکردین و، لە ئیمتیحانی ئاخری ساڵدا زۆری گەڕانینەوە و، کە من یەکێ بووم. ئیتر هێمان بە تەمای چوونە ئەستانبووڵ نەمابووین کە ببین بە زابت. وە لەبەرئەو ناکۆکییەی بەینی ئێمەو قوتابییە عەرەبەکان، هیچ فێری عەرەبی نەبووین، گەرچی سێ ساڵی ڕەبەق لەگەڵیان بووین..

*　　*　　*

(1)نازم پاشا 1909-1911 والیی بەغدا بووە (الدکتور عماد عبد السلام رؤوف، ادارة العراق، بغداد، 1992، ص 87).

(2)واتە پاپۆڕ.

(3)بینباشی: موقەددەم.

(4)وەلاّمە برووسکەیەك لەگەڵ وەلاّمدا.

5-جۆرە دراوێکی عوسمانییە.

*　　*

*ئەم نووسینە چوار لاپەڕەی بیرەوەرییە دەستخەتەکانی بەهەشتی ڕەشید شەوقیی ئەفسەرو بەڕێوەبەری ئیدارەخانەی گۆڤاری "دیاری" کوردستان/ 1925-1926"، ئامادەکراوە بۆ چاپ و لە وەزارەتی ڕۆشنبیرییە

تێبینی:

ئەم بابەتانە لەنامەخانەی بریانی بەڕێز کاکە ڕەفیق ساڵح و کاکە صدیق ساڵحی برایەوە وەرمانگرتوون، ئێمە ویڕای ڕێزی زۆرمان بۆ ئەو ئەرکەی کێشاویانە سوپاسی هاوکاریی بەردەوامییان دەکەین.

ڕۆڤار

# ئەمین فەیزی بەگ
# ئەفسەرو ئەدیب

مستەفا نەریمان

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بزووتنەوەی نیشتمان پەروەری میللەتانی ژێر ڕکێفی عوسمانیەکانی هەژاندەوە، ولاتەکانی بەلقان و بەشی ژووروی ئەفەریقا لەژێر چنگی (پیاوە نەخۆشەکە) دەرچوو، میللەتانی ژێر دەستە لە حەیاتدا بوون و هاتبوونە ویزەی داگیرکەرانەوە تیشکی ڕۆشنبیری پرشنگی دابووەوە، لەم مەیدانەدا کوردیش هەنگاوێکی نابوو، لە ئەستەمبوڵ مەدحەت بەدرخان لە ساڵی 1215 ك- 1897ی زاینی یەکەم ژمارەی لە ڕۆژنامەی کوردستان بڵاوکردەوە. پاش ماوەیەك هەر لە پایتەخت کۆمەڵی (هەیڤی) دامەزراند و لە ساڵی (1221 ی کۆچی) گۆڤارێکی هەفتەیی بەناو ڕۆژی کوردەوە بڵاوکردەوە هەر ئەم گۆڤارە لە ساڵی (1227) ناوی گۆڕا بە (ژین).

ئەم بزوتنەوەیە کوردی ئەوسای لە دەور کۆبوەوە بە تایبەتی ئەو فەرمانبەر و ڕۆشنبیرانەی کە لە ئەستەموول بوون، جا (ئەمین فەیزی) یەکێك بوو لەو ئەفسەرانەی ئەو سەردەمە کە لە مەیدانی ڕۆشنبیری ناوبانگی دەرکردبوو، ئەم زاتە بە وەزیفەی میری بەملاو بەولادا هەڵ دەدرا بەڵام لە نوسین و بڵاوکردنەوە خزمەتی خۆی دەکردو لەوکاتەدا کتێبێکی کوردی لە چاپداو بوو بە هۆی ئەوەی لەبیر نەچێتەوە.

لە لاپەڕە (348)ی مێژووی کورد و کوردستاندا ئەمین زەگی بەگ، لە هەشت دێڕدا ئەمەی لەسەر نوسیوە (لە ئەهالی سلیمانیەوە ئەفسەری تۆپچی بوەو گەیشتوەتە ڕوتبەی میرلیوا، لە ساڵی 1928 لە ئەستەموڵ کۆچی دوایی کردوە. لە ماتماتیکدا (ریاچیات) دەستێکی درێژی هەبوەو دوو کتێبی وەکو- اجمالی نتائج و هوای نسیمی- تیادا داناوە، وە شعاعات و ئەنجومەنی ئەدیبانیشی بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەدیب بوە، لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانی هاوڕێیەتیەکی بەهێزیان لە ناودا هەبوەو بە شیعر و پەخشان کاغەزیان بۆ یەك نوسیوە، شێخ ڕەزا لە زۆر شیعردا مەدحی کردوە).

کە چاوم بە کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبان) و (شعاعات) کەوت هەندێ لای شاراوەی ژیانی ئەمین فەیزیم بۆ ڕوون بوەوە، شعاعات دیوانی شیعری شاعیر ئەمین فەیزی‌یە کە وەك لەم دیوانە ئاشکرایە ئەم شاعیرە هەر پارچە شیعرێکی وتبێ مێژووی وتنی شیعرەکەو شوێنەکەی و هەندێ جار مەبەستەکەشی دەربڕیوە لەم مەیدانەدا هیچ نوسەرو شاعیرێك تا ئێستا پەیڕەوی نەکردوە بەمە لە گەڕان و ئامشوو مەبەستەکانی گەیشتووین بەم پێیە بۆمان دەردەکەوێ ساڵی (1201ك 1884ز) سلێمانی بەجێ هێشتوە و چوەتە بەغداو لەوێوە لە ساڵی (1307ك- 1889ز) چوەتە ئەستەموڵ پاش دوو ساڵ گەڕاوەتەوە بەغداد لە ساڵی (1318-1900ز) چوەتە موسڵ وەتا ساڵی (1908) لە شارەکانی بۆمبای و مەکە و بەیروت و شام و قودسدا بوەو ئینجا گەڕاوەتەوە بەغداد و چوەتەوە سلێمانی ساڵی (1909) بە یەکجاری چوەتەوە ئەستەموڵ و تا کۆچی دوایی لەوێ ماوەتەوە.



لە دوا لاپەڕەی (ئەنجومەی ئەدیبان)دا ناوی ئەو کتێبانەی تۆمار کردوە کە چاپی کردون، لەسەر شێوەی نوسینی خۆی بەم چەشنە نوسراوە:

1-اجمالی نتائج- خلاصەی دە فەننە لە ریاچیات و گبیعیاتدا.

2-هوای نسیمی- باحپە لە احوال حكمیە و كیمیاویەی هەوا.

3-شعاعات- مجموعەی اشعارە كە لە گرف خۆیەوە نەڤم كراوە.

لە لایەکی ترەوە بە تورکی دەڵی کتێبێکی بەناو (تفرقەو ریاچیە) کە دەربارەی (جەبرە) لەژێر دەستدایەو ئامادەی چاپ کردنە.

کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)ی لە ربیع الاول 1339ی کۆچی لە چاپخانەی (ترجمان حقیقت) لە ئەستەموڵ چاپکردوە لە بەرگی یەکەمیدا نوسیویە دەڵێ (تألیف) ئەمین فەیزی بەگە میر مومی الیە یەکێکە لە موتەقاعدین ئومەرای عەسکەریەو لە خەواص ئەهل سلێمانیە) کتێبەکە بریتیە لە 142 لاپەڕە و لەسەر کاغەزی بۆر بە قەوارەی (16.2 × 11.2) چاپکراوە، لە حەوت لاپەڕەدا پێشەکی بۆ نوسیوە و هۆی چاپکردنی بەم جۆرە دەربڕیوە (نودەباو شوعەرای کورد زۆرن لاکین ئاساریان بە تەواوی جەمع و تەئلیف نەکراوە من نیەتم کرد کە بەعزێ لە ئەشعاری کوردی بابان تەبع و نەشر بکەم تا بزانرێ موڵکی بابان چەند مەنبەعی فەیز و زەکایە. لە شیعری هەر شاعیرێ چەند پارچەیەکم ئینتیخاب کرد لەو مونتەخەب رسالەی ئەنجومەنی ئەدیبانم هێنایە وجود بەم وەسیلەیە تالبان و ڕاغبان کەمێك خەلاس بوون لە

شیعر نوسینەوە کە لەسەر دەفتەری پارچەپارچەیە). ئەوی شیاوی باس بێت لەم کتێبە تەنیا ئەم دوو تاک شیعرەی خۆی تیادایە.

1–گەر ڕەفیقت یاری سادق بێ چە باکی ڕێگەتە
گەر کەسی بەدخوت لە گەڵدا بێ جەهەنەم جێگەتە
2–کە جەیش غەم هجومی کرد نیزامی عومر من تێکچوو
ئیتر مومکین نیە ئاسایش حاڵی پەرێشانم
بینای بورجی بەدەن ڕووخا بە گولەی حادیسات ئەمڕۆ
ئەما قوەت لە ئەژنۆمدا بڕا پشتم شکا شانم

هونەری ئەدەبی و هەستی نیشتمانی ئەمین فەیزی بەگ لە دیوانی (شعاعات)دا دەردەکەوێ، ئەم کتێبە لە ساڵی 1217ی کۆچی لە چاپخانەی (نیسان بابکیان) لە ئەستەموڵ چاپکراوە، دیوانەکە بریتیە لە 47 پارچە شیعر کە هەموی بە تورکیە وا لێرەدا چەند پارچەیەکیان لێ دەخەینە بەردەست.

لە ساڵی 1324ی کۆچی ئەم پارچە شیعرەی لە بەغداد بەناو (حریت)ەوە وتوە ئەمە چەند چوارینەیەکە لەو پارچەیە:

بحمدالله ایرشدی دوره، گلزار حریت
جلادار ایتدی چشم امتی دیدار حریت
دل لاهوتیانده اکتساب انشراح ایتدی
یتشدکده سماع عالمه اخبار حریت

واتە (سوپاس بۆ یەزدان کە دەوری گوڵزاری سەربەستیمان پێ گەیشت و دیدەی نەتەوەکەمانی بریسکاندەوەو دڵمان کرایەوەو ئەوا دەنگی سەربەستی هاتە بەر گوێی هەموو دنیا..)

جهان بر عرصه. هیجا ایدی ظلم و شقاوتدن
چعیف و عاجز ناچار ایدك خوف اهانتدن
دوچار اولمشدی هپ امال ملت قید اشکاله
اونی چل ایتدی حکم عقل ایله افکار حریت

واتە (زوڵم و زۆرداری ئەم جیهانەی داگرتبوو، بێ تواناو بێ دەسەڵاتەکان لە ژێر باڵی ترسدا دامابوون، هیوای ئەم میللەتە بە کۆت و پەندەوە بەسترابوو، بە هۆش و بیروڕای سەربەستی دوایی بە زوڵم هێنا).

کە قوتابخانەی (اعدادی) لە ساڵی 1306ی کۆچی لە بەغدا کرایەوە ئەمین فەیزی بەگ لەژێر ناونیشانی (مەکتەب) ئەم پارچە شیعرەی وتوە:

حچرت حق بو گوزل مکتبی معمور ایتسین
جمله مامور لرینك سعینی مشکور ایتسین
فیچ الگاف خدا شعشعه پاش اولمقله
بومبارك یرك اگرافنی پر نور ایسین
بواپر برپمر لگف خداوەندیدر
خلقی چوق بویله اپرلر ایله مسرور ایتسین
تربیتخانه، اگفال وگندر مکتب
عون حق دست مصانبدن اونی دور ایتسین
سادق دولت اولان بندهلری شاد ایدەرك
دشمنك روزینی گوزده شب دیجور ایتسین

واتە (یەزدان ئەم قوتابخانە جوانە ئاوەدان بکات و لە هەوڵ و کۆششی مامۆستاکانی ڕازی بێت، ڕوناکی کەوتە ئەم ئاوە هیوامان وایە ئەم دەورووپشتە هەروا بمێنێت، بەم بەرهەمە تا سەر دڵی خەڵق خۆش بێت، قوتابخانە جێی پەروەردە کردنی منداڵانی نیشتمانە، یەزدان لە کارەسات دووری بخاتەوە، بەندەی ڕاستگۆ داوادەکەم تاریستانمان بکاتە ڕۆژی ڕووناك و چاوی دوژمنی پێ کوێر بێت..)

لە ساڵی 1321 لە شامەوە ستایشنامەیەکی 17 دێڕ شیعری پێشکەش حەمدی پاشای بابان کردوە ئەمە چەند دێڕێکە لەو پارچە شیعرە:

داور ملك كرم حچرت حمدی پاشا
کورمەحسن چشم فلك داتنه مپل و پانی
مرد میدان همم انجق اودر عنلده
ویرمدی ویرمیەجك کیمسەیە اول میدانی
کرچه حدم یوق اونك قدرینی تقدیره فقگ
یا قیشر اولسه فلاگون حکم عنوانی
ایدەرز اویله ایسه بزده اوکا عرچ پنا
او غرینه وقف ایدەرك صدق ایله جسم و جانی

واتە (فەلەك تا ئێستا یەکێکی تری وەکو حەمدی پاشای بابانی بەخۆیەوە نەبینیوە، لە مەیدانی شەڕدا لە ڕیزی پێشەوەیە، هەرچەندە تەقدیری زاتێکی وەکو ئەو لە توانای مندا نیە، بەڵام ناتوانم ئەفلاتونی پی بڵێم، بە سوپاسەوە ڕوح و گیانمی لە ئۆغردا بەخت دەکەم).

وەك لە سەرەوە وتمان شێخ ڕەزای تاڵەبانی ستایشێکی زۆری ئەمین فەیزی کردوە زۆربەی بە فارسیە هەر ئەم تاکەی بە کوردیە:

کە تەشریفی شەریفی هات ئەمین فەیزی بە میوانی
لە عەهدەی شوکری دەرناچم مەگەر خۆم کەم بە قوربانی

سەرچاوە:

بەیان، ژمارە (24) نیسان 1975، لاپەڕە (12–13)



# ئەمین فەیزی بەگ
# شاعیر و زانا و پڕ میێشکی مەزن

حسێن حوزنی موکریانی

ئەم پیاوە مەزنە کوردە لە شاری سلێمانی لە دایک بوە، خوێندنی مەدرەسەکانی ئەوێی کە تەواو کردوە چۆتە بەغدا، مەدرەسەی عەسکەری ئەوێشی بە پایان گەیاندوەو چۆتە ئەستەمبوڵ لەوێش خوێندویە تا بۆتە ئەفسەرێك و چۆتە سوپای عوسمانیەوە هەر چوە بەرز بوە تا گەیوەتە ڕوتبەی تۆپچی میر ئالایی. لەو ڕوتبەدا تەقاعود کراوە. شەڕی جیهانی ڕابردووی لە سوریەو حەلەب بەسەربردوە، لە پاش هودنەی عومومی ساڵی 1918 گەڕاوەتەوە ئەستەمبوڵ، لە پاش چەندێك بە نەخۆشی لەرزەك "فلج" گرفتار بوو لە خەستەخانە خەوت، ساڵی 1923 لە گول خەستەخانەسی بە ئامر زشتی خدا شادبوو، کە نەخۆش کەوت هەندێك دراو و کتێب و ئەشیای لە لای هاوشارێکی خۆی بە ئەمانەت دانابو هێشتا مابو کە ئەو هاوشارییەی هەموو کتێب و دراوەکەی هەڵگرت و گەڕاوە وڵاتی خۆی. گەلێك ئاساری گران بەهای نوسیبونەوە لەناوچون، گەلێك دیوانی شیعری هەموو شاعیرەکانی کوردی کۆکردبوونەوە ئەوانیش لەگەڵ کتێب و دراوەکەیدا ون کران.

ئەو پیاوە مەزنە، زمان زانێکی زۆر بەنرخ بوو. کوردی، فارسی، عەرەبی، تورکی، فەرەنسایی، ئەڵەمانی زۆر باش دەزانی. دەینوسی و دەیخوێندەوە. لە ئەدەبیاتیاندا زۆر سەرکەوتوو بوو، هەر بەو هۆیەوە بوو، لە ئەکادیمیای فەرەنسە ئەندامێکی هەمیشەیی بەڕێز و بەنرخ بوو.



گەلێك تەئلیفاتی گرانبەهای خۆی لە دەمی ژیانیدا چاپ کردن. لەوانە کتێبی "ئەنجومەنی ئەدیبان" کە شیعرە هەڵبژاردوەکانی شاعیرە بەناوبانگەکانی کوردن کۆی کردبوونەوەو کردنیە ئەم کتێبەو لە چاپی دان. کتێبی "کوردستان" دێرێك کوردستان و تەرجەمەی هەندێك پیاوانی کوردە چاپی کرد. لە تەئلیفەکانی تەنیا ئەو دوو کتێبەی بە کوردین، هی تری بە تورکیە دیوانێکی بەرزی بە تورکی داناوەو لە چاپی داوە ناوی "شعاعات"ە نوسخەیەکی بۆ من ناردوە بە دەست نوسینی خۆی ئەم شیعرە تورکیە کە هی خۆیەتی لە پشت کتێبەکەوەی نوسیوە کە دەڵێت:

"سانعی بندا شاعیرم نظمی ابیات ایەرم
آفتاب همتم نشر شعاعات ایلەرم"

لەگەڵ هەموو شاعیر و ئەدیب و عولەماکانی کورددا سەرو ساتی هەبوو، هەموو شیعر و دیوانە کوردیەکانی لەلا بوو.

ئەمین فەیزی بەگ پیاوێکی دینداری بە نوێژو ڕۆژی پڕ باوەڕ بوو، چوبوو فەریزەی حەجی بەجێ هێنابوو، لە خێرات و چاکەو پیاوەتی پاش نەدەکەوت، ئەمین و ڕاست و دروست و بە وەفاو خاوەن شەرت و پەیمانی خۆی بوو، دڵپاك و دەرون خاوێن، کردەوە چاك و بێ درۆو بێ فیزو فێڵ و بێ دەسیسە بوو، بۆ نیشتمان و میللەتەکەی دڵسۆز و



خێرخوازو بە پەرۆش بوو، وا بزانم یەکەمین پیاوێکە لە ریزی خۆیدا کە پێ بەوە بردبێ و زانیبێتی دەرد چیەو دەرمانی کامەیە، وە لە نێو هاودەم و هاوشاریەکانیدا یەکەم کەسێکە کە وشیار بووبێتەوە لە خاك و وڵاتەکەی ئاگاداربوبێ و ئەخۆشی هاوخوێن و هاوزمانەکەی زانیبێ، بۆیە بە گەرمە تەقەلادابو، دیوان و شیعرەکانی کوردی کۆکردبونەوە کە چاپیان بکات و بۆ هەموان شەرح و پێشەنگی نوسیبوو بەڵام ئەخۆشی لەو ئارەزوە ی پاش خست و هاوشاریەکەشی دەستی بەسەر ئەو گەنجینە بەنرخەدا گرت، مەرگیش دەرفەتی نەدا.

پتر لەگەڵ موفتی زەهاوی بەغداو مەستی ئەفەندی سەرەك حوكەماو شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا زۆر ڕێك بوو، سەرگوزەشتەی هەموو شیعر و غەزەل و قەسیدەکانی شێخ ڕەزای زۆر باش دەزانی وە دێڕێکی هەموو شیعرەکانی یەك بە یەك لە بیر بوو وە لە دیوانەکەی شێخ ڕەزادا نوسیبوی. لەگەڵێك جێگایاندا بەم شیعرەی شێخ ڕەزا شانازی دەکرد کە وتویەتی:

**"کە تەشریفی شەریفی هات ئەمین فەیزی بە میوانی،**

**لە عەهدی شوکری دەرناچم مەگەر خۆم کەم بە قوربانی"**

ئەمین فەیزی بەگ دەی وت بێجگە لە من کەس لە زمانی شێخ ڕەزا ڕزگار نەبوە. وە لە بابەت ئەمین فەیزی بەگەوە بە کوردی و تورکی شیعری زۆر پێدا هەڵگوتوە، و بە فارسی پتر سیاسی دەکات. لەم وتارەدا ناگونجێ درێژەی پێ بدەم دەبێ کتێبێکی ئەستوری بۆ تەئلیف بکرێ.

ئەمین فەیزی بەگ یەکەتای سەدەی دوای، وە بەرزترین نوسەر و عالم و شاعیر و ئەدیب و مێشك ڕوون و تێگەیشتووی کورد بوە. خودا بە ڕەحمەتی خۆی شادکات.

ئەمین فەیزی بەگ بۆ خۆی نامەیەکی چلونی خۆی هەر لە دایك بونی تا چاپی نامەکەی دورو درێژ نوسیوەتەوە، لە بەرگێکی بچوکدا چاپی کردوە، تەواوی سەرگوزشتەو خوێندن و وەزیفەو مەئموریەکانی تێدا وتوە، باسی هەموو عولەما دۆستەکانیشی دەکات، لەو دەمانەی کە لە ئەستەمبوڵ بوە پتر هاونشینی ئەحمەد پاشای بابانی کردوە.

**سەرچاوە:**

**گۆڤاری دەنگی گێتی تازە، ژمارە 2 بەرگی 4 سالی 4، مایس 1945**



# ئەمین فەیزی
# بەهرەوەرێکی کوردی لە بیر کراو

ئەحمەد تاقانە

**پێشەکی:**

بە داهاتنی ساڵی 1850، ئەوسا، کە ئیسماعیل پاشا (سەرکردەیەکی تورک بوو)، کاتێ جێی دوایین پاشای بابانیانی گرت، کۆتایی نزیك بووەوە. بەم جۆرە ئەو بنەماڵەیەی کە نزیکەی سەدەو نیوێك بە زەبرو زەنگەوە دەسەڵاتی بەسەر خاکێکی بەریندا گرتبوو، لە کوردستان ئاوابوو.. ماوە درا ئەو ئاگادارییانەی لەسەر کاغەز تۆمار کرابوون بخرێنەوە کارو، بەو مووچە خۆرە ترسنۆکانە کە بە پارە دەکڕران و دەفرۆشران و... بە ئیستیغلالە گەندەکەو، بە زمانی بێگانەی تورکی[1].

دوا بەدوای ئەم ڕووخانە سیاسییە، وڵات کەوتە بارێکی ترەوەو، دەسەڵاتی (سەیید) و پیاوە ئایینییەکان پەرەی سەند، ئەمەیش بە هۆی ئەوەوە بوە کە خەڵکەکە زۆر گیرۆدەی ئایینەکە بوون و خۆیانیان پێوە بەستبوو[2].

زوربەی ئەو بەهرەوەرانەی کە لەم وڵاتانەدا بوون و نەیانتوانی دەسەڵاتێکی ئایینی پەیدا بکەن ڕوویان کردە (ئەستەمبوڵ) بۆ ئەوەی خۆیان بخەنە پێش چاوی سوڵتان و پیاوە گەورەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بە تایبەتی کە لەم سەردەمەدا ئەدەب (بە تایبەتیش ئەدەبی تورکی- کە زمانی فەرمانڕەوایانی دەوڵەت بوو) لە پەرەسەندندا بوو، بە هۆی ئەو نزیك بوونەوەیەوە لە ئەورووپاوە و دوای دەرکردنی "خط-ی شریف گوڵخانە" کە لە ساڵی 1839دا لە لایەن سوڵتان عەبدولمەجیدەوە دەرکراو، بوو بە یاسایەکی گشتی و نیشانەی سوود وەرگرتن لە ڕژێمەکانی دەوڵەتە خۆرئاواییەکان.. تورکەکان ئەم سەردەمە بە سەردەمی (تەنزیمات) ناو دەبەن[3].

زۆربەی زۆری ئەو کوردانەی کە ڕوویان کردە وڵاتی ڕۆم (کە بە تورکیایان دەوت)، بێ سەروشوێن لەوێدا سەریان نایەوەو بەرهەم و شاکاری هەرە زۆریان لەناوچوو.. یەکێك لەوانە (ئەمین فەیزی) بوو کە بابەتی ئەم باسەمانە، کە لەگەڵ بەهرەمەندییەکی زۆر و پایەیەکی بەرزدا، ناوی هەر ئەوە لە تویی چەند لاپەڕەیەکی پەرت و بڵاو بەوڵاوە هیچی تر لە بارەیەوە بەرچاو ناکەوێ.

هەروەها هەندێك لەو کەسانەی کە چووبوونە ئەستەمبوڵ، بیریان لەوە کردۆتەوە و زانیویانە کە مانەوەیان لە دوور وڵاتیدا بێ سوودە.. ئەوە شێخ ڕەزای تاڵەبانییە لە شیعرێکیدا کە بۆ مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەی نووسیوە و هەر لە شیعرەکەدا دیارە کە لە کاتی نووسینەوەیدا هەردووکیان لە تورکیا بوون..

شێخ دەڵێ:

**شیعر من در هر سو و از همه کشور ساری**
**علم تو در همه جا بر همه کس معلوم است**
**میرود شعر من و علم جهانگیر شما..**
**هردو بی‌فائده، تا جای اقامت روم است**[4]

جا ئەوانەی کە گەڕانەوە.. بەرهەمەکانیشیان لەوانی تر چاکتر پارێزراوەو سوودیشیان پتر بوە.



### ئەمین فەیزی

ژیانی:

ئەمین فەیزی کوڕی دەروێش قادره[5] و خەڵکی سلێمانییە[6].. ئەگەرچی مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەڵێ: "تەئریخی لە دایك بوون و مردنی نەنووسراوە"[7]، عەلی کەمال باپیر دەڵێ: لە ساڵی (1278)ی ڕۆمی- واتە (1862)ی زایین- لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە[8].

دوا پلەی خوێندنی لە ساڵی (1310)ی ڕۆمیدا- (1894)ی زایین- لە قوتابخانەی جەنگیی شاهانە، لە ئەستەمووڵ تەواو کردوە، لە (1320)ی ڕۆمیدا- (1904)ی زایین- کراوە بە سەرکردەی فەوج و نێرراوەتە شاری مەدینە، لەوێوە بۆ مەککەو لەوێ زیارەتی کردوە و نێرراوە بۆ هیندستان[9]. هەروەها



مامۆستا (عەتا تەرزی باشی) لە کتێبی کرکوك شاعرلری-دا کە ئەویش لە (ئیبنولئەمین)ی[10] وەرگرتوەو، لە زمانی ئەمین فەیزییەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

لە (1320)دا بۆ حەج کردن بە تەمای چوونە حیجاز بووم، کە ئەمەم بە شێخ واتە شێخ ڕەزای تاڵەبانی- ڕاگەیاند، پێی وتم: "حەج کردن بۆ تۆ فەرز نییە، مەچۆ"، منیش ئەم دێڕە هۆنراوەیەم بۆ خوێندەوە:

**مقصدك خالق ایسه خلقه نیازه گیتمه**

**املك عشق حقیقی ایسه مجازه گیتمه**[11]

شێخ دوای کەمێك بیرکردنەوە بەم دێڕە بەرامبەری دێڕەکەمی دایەوە:

**كعبهء دل گبی بر طور تجلیگك واردر**

**سندەدر منزل مقصود حجازه گیتمه**[12]

لە سەردەمی عوسمانیدا، کە هێشتا (قوڵ ئاغاسی) بوە، بەڕێوەبەری قوتابخانەی جەنگی بوە لە بەغدا[13]، بەینێکیش لە سلێمانی قوماندانی لیوا بوەو(14) ئەوجا میرئاڵای تۆپچی (واتە- کۆلۆنێل) بوە[15].

میرئاڵای تۆپچی بەرزترین پایە بوە کە لە لەشکری عوسمانیدا پێی گەیشتبێ[16]، مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە ساڵی 1915ی زایین دا لە سووریە لە شاری (حەڵەب) دیویەتی، ئەوساکە نەخۆش بوەو لە ژووری خانێکدا بوە[17] وەکو مامۆستا ئەمین زەکیش دەڵێ:

تووشی نەخۆشی ئیفلیجی بوە و چەند ساڵێکیش بە ئازاری ئەم نەخۆشییەوە لە نەخۆشخانەکانی ئەستەمبووڵدا کەوتوە[18] لە پاش دامەزراندنی ڕژێمی فەرمانڕەوایی (نیابی).. واتە ئەوەی کە پێیان دەوت (مەشروتیەت) لە کار خراوەو (تەقاوید کراوە)[19].

لە دوای ئەوەی کە تەقاوید کراوە، خۆی هەر بە نووسین و خوێندنەوە و گەڕانەوە خەریك کردوە. هەروەها گەشتێکی ئەورووپایشی کردوەو.. ڕۆژانی دوایی لە ئەستەمووڵدا بەسەر بردوە[20].

لە مێژووی مردنیدا مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەڵێ لە ساڵی (1340-1341)ی ڕۆمی (1925)ی زایینیدا مردوە[21]، مامۆستا عەلی کەمال باپیریش هەر ئەو قسەیەی کردوە[22]. مامۆستا ئەمین زەکی بەگیش دەڵێ[23]: لە (دارولعەجەزە)یەکی ئەستەمووڵدا، لە ساڵی 1928ی زایینیدا کۆچی دوایی کردوە. ئەوەی شایانی باسە، ئەم دوو مێژوە بە تەواوی بەرامبەری یەکتر و ڕێك نین.. هەرچۆنێك بێ زوربەی ئەو زانیاریانەی کە لە بارەی ئەمین فەیزییەوە چنگ دەکەوێن جێی لێکۆڵینەوەن و لە وتارێکی وەهادا ماوەی ئەوە نیە ئەو شتە وردانە ساخ بکرێنەوە.

### پایەی ئەدەبی و زانستی:

مامۆستا ئەمین فەیزی، ئەدیبێکی بەرز و ڕەوشت چاك بوە، دەستێکی باڵای لە زانستی ماتماتیك دا هەبوە(24)، دەستێکی باڵای لە زانستی ماتماتیکدا هەبوە[24]. کوردێکی دڵسۆز و لە بەهێزترین پشتگیریکەرانی بزووتنەوەی زانستی و ئەدەبی بوە و خەڵکی خۆشویستوە، سەرەڕای ئەو پایەبەرزییەی کە لە سوپادا هەیبوە، ژیانێکی سادەی ڕابواردوە[25] مامۆستا حیلمی وتەنی: سەربازێکی زاناو ئەدیبێکی سەرباز بوە. لەگەڵ ئەوەیشدا وا دەرکەوتوە کە مامۆستا فەیزی زۆر خۆی بە شیعر و ئەدەبەوە

خەریك نەكردبێ، بەڵام دیسانەوە بە مامۆستای شیعر و ئەدەب ناسراوەو لە شاعیرە بەناوبانگ و بە سەلیقەکان ژمێرراوە[26].

مامۆستا فەیزی کە توانایەکی باشی لە شیعر و ئەدەبدا بوە، زوربەی ئەو نامانەی کە ئەم و (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) بۆ یەکتریان ناردوە.. هەر بە شیعر بوە. هەندێك لەو نامە هۆنراوانەی لەو کتێبەدا چاپ کراوە کە ناوی (ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد)ی لێناوە[27]. یەکێ لەو هۆنراوە (تورکی)یانەی کە شاعیری مەزنی کورد شێخ ڕەزا تێیدا باسی ئەمین فەیزی کردوە ئەمەیە کە دەڵێ:

استاد سخن، میر سخن سك

خلاق معانی دنیلان وارایسه سن سك

ای كان كمالات (امین فیضی) افندی

مجموعهء خلق (حسن)، خلق (حسین) سك[28]

هەروەها لە تاکێکی فارسیدا، شێخ پێی دەڵێ

در حضر ممتاز و ممتاز از سفر آمدی

اول او آخر (امین فیضی) تو ممتاز آمدی[29]

بەم جۆرە دەبینین و دەبیسین کە، شێخ ڕەزا بە نرخ و پایەو بەهای بەهرەکانی ئەمین فەیزی زانیوەو ڕێزی لێ گرتوە[30].

ئەمین فەیزی لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی و ڕەخنە لێگرتنیشدا دەستی هەبوە، تەنانەت لە پێشەکی کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)دا نمونەیەکی بچووك لە هەڵوێستی بەرامبەر بە شیعر دەبینین کە بەراوردێك لە نێوان نالی و شێخ ڕەزادا دەکاو دەڵێ:

"ڕەکای نالی ئینکار ناکرێ، لاکین ئەوەندەی صەنایعی لەفزییە ئیستیعمال کردوە پیاو ڕەنگە بڵێ شیعری ئەو نەتیجەی عیلم و ئیشتیغالە. شیعری شێخ ڕەزا ئەوەڵەن وەهبی و فیتری بوو، سانیەن کەسبی)[31].

ئەم باس و خواسانە پایەو بەهرەی ئەمین فەیزیان وا بەرز کردۆتەوە لیژنەی زانستی لە پاریس میدالیایەکی پێ بەخشیوە[32].

بەپێی باری ژیانی ئەو سەردەمە، دەبینین ئەمین فەیزی هاتووچۆی پیاوماقوولانی ئەو سەردەمەی کردوە و شیعری بۆ وتون.

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە زمانی ئەمین فەیزییەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا چوون بۆ بەخێرهاتن کردنی (کاظم پاشا) کە بە قسەی مامۆستا خاڵ برای سوڵتان عەبدولحەمیدە.. لەو سەردەمەدا دوورخراوەتەوەو، لە بەردەمی پاشادا شێخ ڕەزا نیو دێڕە شیعری وتوە کە ئەمەیە:

دەوڵەتی سادقەسی چوق یەشە پاشا[33]

ئەمین فەیزیش بەم نیوە دێڕەی خوارەوە دێڕە هۆنراوەکەی تەواو کردوە:

کیمه الماز سنه مانند معادل حاشا[34]

ئینجا چوون بۆ لای (نیزامولعولەما) کە ئەویش هەر دوورخراو بوە.. شێخ ڕەزا لەوێشدا نیو دێڕی یەکەمی تاکە شیعرێك دەڵێ و ئەمین فەیزیش بۆی تەواو دەکا، دێڕەکەیش ئەمەیە:

انتظام همه عالم به نظام العلماست

این سخن مظهر تصدیق جمیع حکماست[35]



شایانی باسە ئەم شیعرە بە هەردوو نیوەکەیەوە، لە دیوانی شێخ ڕەزادا بە هی شێخ ڕەزا دانراوە[36].

هەروەها دەبینین (عەباسولعەزاوی) کە باسی ڕوداوەکانی ساڵی 1307ی کۆچی- 1889ی زایین دەکات.. ئینجا باسی هاتنی (سرِی پاشای والی بەغدا) دەکا، دەڵێ: لە پێدا هەڵدانیدا شیعری تورکمان بەرچاو کەوتوە، لە هەڵبەستی (نەسری ناتیق ماردینی) و.. هەروەها هی مامۆستا (ئەمین فەیزی).

مامۆستا عەزاوی سووکە ڕەخنەیەکیشیان لێ دەگرێ و دەڵێ: ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە کە ئەمانەو کەسانی تریش دوای ڕۆیشتنی والی پێیاندا هەڵنەوتوە، بەڵکو بەر لەوە بوە کە چاکەی لێ ببینن، ئەویش بۆ ئەوە بوە کە لێی نزیك ببنەوە[37].

**بەرهەمەکانی:**

وا دیارە ئەمین فەیزی وەکو ئەوانی تر خزم و کەس و کاری نەبوە شیعرە کوردیەکان و بەرهەمەکانی کەی کۆبکەنەوە، یان خەڵکی تر لەبەر ئەوان بایەخ بە بەرهەمەکانی بدەن.. چونکە وەکو مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەڵێ- ئەوە جێگەی شك نیە کە

ئەمین فەیزی بێجگە لە تورکی و فارسی، بە کوردیش شیعری زۆری هەبووە.. تەنانەت مامۆستا حیلمی خۆی لێی بیستوە[38].

مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەگەڵ ئەوەی کە بۆیشی گەڕاوە تەنیا چوارینەیەك و تاکێکی ئەمین فەیزی نەبێ چی تر دەس نەکەوتوە، لە چوارینەکەیدا دەڵێ:

**کە جەیشی غەم هجومی کرد نیزامی عومری من تێکچوو**

**ئیتر مومکین نیە ئاسایش حاڵی پەرێشانم**

**بینای بورجی بەدەن ڕوخا بە گوللەی حادیسات ئەمڕۆ**

**ئەما قوەت لە ئەژنۆما بڕا پشتم شکا شانم[39]**

**تاکە شیعرەکەش ئەمەی خوارەوەیە:**

**گەر ڕەفیقت یاری صادق بێ چە باکی ڕێگەتە**

**گەر کەسی بەدخوو لەگەڵتا بێ جەهەننەم جێگەتە[40]**

هەروەها (عەلی کەمال باپیر)ی شاعیر لە کتێبەکەیدا پارچە هەڵبەستێکی بۆ تۆمار کردووین.

هەڵبەستەکەیش ئەمەی خوارەوەیە:

**دڵ وەك بلبل ئەناڵێنێ هەمیشە زار زار**

**بۆ فیراقی ڕوویی جانان بێ سکون و بێقەرار**

**هێند لەبەر دووریت ئەناڵێنم لەبەر دەردی دڵم**

**خوێن لە چاوم دێت بەخوڕ وەك ئاوی بارانی بەهار**

**چاوەکەم هەرچەند کە تۆ دووری لە من ئەمما بەخوا**

**دڵ لەلاتە ڕۆح لە دەورانت ئەدا پەروانە وار**

**عاشقی ڕووتم ئەگەرچی وا لە من بێزاری تۆ**

**چاوی من هەر تۆی وەکو مەنصور ئەگەر بمدەن لە دار**

**ئەی ڕەقیب یارت لە من کرد سا بەسە دەست هەڵگرە**

**ماڵ خراپی دەستی تۆ بەس بێ ئەرێ هەی نابەکار**

**دەك منت لەو قاپیە وێڵ کرد بە ناحەق وەك ڕەقیب**

**دەردی زکتە بتگرێ چارت نەکەن قورب و جیوار**

**سەگ سیفەت سەد جار قرۆڵ بێ کاری تۆ بێ مایەیە**

**جان فیدای ئەو ئاستانەم تا قیامەت خاك سار**

**ناڵە ناڵی (فیضی)یە وا خەڵکی عاجز کردوە**

**هەر لە گۆشەی چاوەکەی جاری بوە سەد جوێبار[41]**

(عەتا تەرزی باشی)یش لە (کرکوك شاعرلری)یدا ئەو چوارینە تورکیەمان بۆ دەخاتە پێش چاو کە وەڵامێکە، لە ئەنجامی ئەوە کە شێخ ڕەزا چەند شیعرێکی بۆ ناردوە و دەڵێ:

**واصل اولدی دستمە اشعارکز**

**پك گوزلدر طوغریسی افکارکز**

**غرق نور مفخرت اولدق اوگون**

**چوق شکر بو عبد بی مقدارکز[42]**

ئەو کتێبە چاپکراوانەی کە مامۆستا ئەمین فەیزی بەرهەمی هێناون ئەمانەن:

1-تفرقە ریاضیە.. (لە زانستی جەبردا).

2-اجمال نتایج.. (ماتماتیك و تەبیعیات).

3-هوای نسیمی.. (لەبارەی با-وەیە).

4-شعاعات.. (کۆمەڵە شیعری خۆیەتی).

5-انجمن ادبیاتی کورد.. (پێشەکیەك و کۆمەڵە شیعری چەند شاعیرێکی کورد)[43] سێ کتێبی یەکەمیان بە زمانی تورکین. ئەمین زەکی دەڵێ چوارەمیان بە زمانی کوردی نوسراوە(44) بەڵام مامۆستا ڕەفیق حیلمی ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگرێ و دەڵێ ئەویشیان بە زمانی تورکیە[45].

پێنجەمیان (انجمن ادبیانی کورد) بە کوردیەو بە سەرچاوەیەکی بەنرخی ئەدەبی کوردی دادەنرێ..

هەروەها مامۆستا (گۆرگیس عەدواد) بێجگە لەمانە ناوی کتێبێکی تری نوسیوە ئەویش (علم وارادە)یە لە بارەی فەلسەفەوە نوسراوە[46] بەمەی دواییانەوە دەبنە شەش کتێب.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**

1-اربعە قرون الاخیرە من تاریخ العراق الحدیث س. هـ. لونگریك ترجمە جعفر الخیاط- الطبعە الخامسە- منشورات مکتبە التحریر- بغداد- ص 345.

2-تاریخ السلیمانیە و انحائها- محمد امین زکی- تعریب و تعلیق- محمد جمیل بندی الروژبیانی- بغداد- 1370 هـ- 1951 م- ص 243.

3-اربعە قرون من تاریخ العراق.. ص 336.

4-واتە: شیعری من لەهەر لایەکدا، لە هەموو کیشوەرێکدا بڵاوە، زانستی تۆش لە گشت جێیەکدا بۆ هەموو کەسێك دیارە. شیعری من و زانستی جیهانگیری تۆ.. هەردوکیان تا جێی دانیشتنمان ڕۆم (واتە تورکیای ئەو سەردەمە) بێ سوود دەڕۆن. بڕوانە: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی علی الطالبانی- چاپخانەی مەعارف- بەغدا- 1946، ل 113.

5-شاعیرە ناو ون بوەکانی کورد عەلی کەمال باپیر- چاپخانەی ڕاپەڕین- سلێمانی- 1973، ل 32.

6-خلاصە تاریخ الکرد و کردستان- محمد امین زکی- ترجمە محمد علی عونی- الطبعە الثانیە- مطبعە صلاح الدین- بغداد- 1961- ص 349. مشاهیر الکرد و کردستان- محمد امین زکی، مطبعە التفیض الاهلیە بغداد-1364 ه- 1945 م- الجزء الاول- ص 119.

7-شیعرو ادبیاتی کوردی ڕەفیق حیلمی- چاپخانەی تفیض- بەغدا- 1941- بەرگی یەکەم- ل 30.

8،9-شاعیرە ناو ون بوەکانی کورد، ل 32.

10-ئیبنولئەمین مەحمود کەمال- کە نازناوی (ئینال) بوە، کوڕی (ئەمین پاشای موهردار)ە، جیهانە.. هەروەها یەکێکە لە زانا تورکە بەناوبانگەکانی مێژوو و بیۆگرافیا.. بە چاپ بیۆگرافیای

تورکە بەناوبانگەکان.. بە چاپ کراوو چاپ نەکراوەوە (10) دە کتێبی هەیە.. یەکێك لەو کتێبانە (صوك عصر تورك شاعرلری- شاعیرە تورکەکانی دوایین چاخ)ە کە مامۆستا عەتا تەرزی باشی ئەم باسەو گەلێ باسی تری لەم کتێبەوە وەرگرتوە.. بۆ کورتە مێژووی ژیانی (ئینال) بڕوانە:

Tur meshuvlar, Ansklopedisi- Ibrahim Aiacttin Govsr, Vedigun Nesriyoti 1964.

11-واتە: گەر مەبەستت پەروەردگارە بۆ نیاز ویستن مەچۆرە لای کەس.. ئومێدت دڵداری ڕاستەقینە بێ مەچۆرە دڵداری خوستراوەوە.

12-واتە: طور- چیای طور-ێکی ئاشکرابوونی (جوانی)ی وەکو کەعبەی دڵت هەبێ، مەنزڵ لە لای خۆتە مەچۆرە حیجاز.

بڕوانە: کرکوك شاعرلری عطا ترزی باشی- جمهوریت باصم ئەوی کرکوك- 1387 هـ- 1968 م- ایکنجی جلد- ص 147.

13-شعر و ادبیاتی کوردی- ب 1- ل 24.

14-شاعیرە ناو ون بوەکانی کورد، ل 32.

شعر و ادبیاتی کوردی ب 1- 24، 25.

15-س. پ. ل 25.

16-تاریخ السلیمانیە و انحائها.. ص 243.

خلاصە تاریخ الکرد و کردستان. ص 349.

مشاهیر الکرد و کردستان- جـ 1- ص 119.

17-شیعرو ادبیاتی کوردی ب1- ل 30.

18-مشاهیر الکرد و کردستان- جـ 1- ص 120.

19-س. پ. ل 119.

20-شیعر ادبیاتی کوردی ب 1- ل 25.

21-س. پ. ل 30.

22-شاعیرە ناو ون بوەکانی کورد، ل 35.

23-مشاهیر الکرد و کردستان جـ 1- ص 120.

24-تاریخ السلیمانیە.. ص 243.

خلاصە تاریخ الکرد و کردستان ص 349.

25-مشاهیر الکرد و کردستان- جـ 1- ص 120.

26-شعر و ادبیاتی کوردی- ب 1- ل 25.

27-تاریخ السلیمانیە. ص 243-244.

28-واتە: تۆ مامۆستای قسەو، میری قسەیت، گەر کەسێك هەبێ دروست کەری بەرزی و کانی بڵندی پێ بوترێت هەر تۆی.. ئەی کانی ڕەوشت بەرزی (ئەمین فەیزی) ئەفەندی.. هتد

بڕوانە: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی- ل 254.

29-واتە: لە شارنشینیدا بێ کەم و کوڕیت و کە لە سەفەر گەڕایتەوە دیسان بەبێ کەموکوڕی گەڕایتەوە. ئەی (ئەمین فەیزی) تۆ لە سەرەتاوە لە کۆتاییشدا هەر بەبێ کەموکوڕی هاتووی.

بڕوانن: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ل 254.

30-مشاهیر الکرد- جـ 1- ص 120.

31-انجمن ادیبانی کورد- ئەمین فەیزی- مطبعەی "ترجمان حقیقت" ئەستەمبوڵ- ربیع الاول سنە 1339- ل 6.

32-مشاهیر الکرد و کردستان- جـ 1- ص 120.

33-واتە: هەر بژی ئەی پاشا بۆ خۆت و ڕاستی و دڵسۆزیت بۆ دەوڵەتت- خاڵ.

34-واتە: کەس نیە کە ببێ بە وێنەو هاوتای ئێوە لەم دڵسۆزیەدا- خاڵ.

35-واتە: ڕێکی هەموو جیهانیان بە جەنابی نیزامولعولەماوەیە، ئەم قسەیە جێی بڕوای هەموو تێگەیشتوویەکە.

بڕوانە: گۆڤاری دەفتەری کوردەواری- شێخ محەمەدی خاڵ- چاپخانەی "ئەسعەد" بەغدا- مارت- نیسانی- 1970- بەرگی دوەم.. وتاری شێخ ڕەزای تاڵەبانی- ل 83-84.

36-لە دیواندا، دێڕی یەکەمی هۆنراوەکە بەم جۆرە نوسراوەتەوە:

افتخار همه ایران بنظام العلماست

واتە: شانازی هەموو ئێران بە نیزامولعولەماوەیە.

بڕوانە: دیوانی شێخ ڕەزا- ل 149.

37-تاریخ العراق بین احتلالین- المحامی عباس العزاوی- شرکە التجارە و الطباعە المحدودە- بغداد- 1376 هـ- 1956م- الجزء الثامن- العهد العثمانی الاخیر- ص 93، 97، 99.

38-شعر و ادبیاتی کوردی- ب 1- ل 32.

"نەمویست دەستکاری ئەو ڕێنووسە بکەم کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی پێی نوسیوە".

39-س. پ. ل 24.

مشاهیر الکرد و کردستان- جـ 1- ل 120.

40-شعر و ادبیاتی کوردی- ب 1- ل 29.

41-شاعیرە ناو ون بوەکانی کورد- ل 33.

42-واتە: شیعرەکانتان گەیشتنە دەستم، بیرەکانتان لە ڕاستیدا زۆر جوانن، ئیمڕۆ نوقمی ڕوناکیی شانازی بووین، زۆر سوپاس لە بەندەوە- سوپاسێکی بێ پایان.

بڕوانە: کرکوك شاعرلری- جـ ص 31.

43-تاریخ السلیمانیە- ص 244.

مشاعیر الکرد و کردستان- جـ 1- ص 120.

خلاصە تاریخ الکرد و کردستان- ص 349.

شعر و ادبیاتی کوردی- ب 1- ل 25.

44-تاریخ السلیمانیە- ص 244.

45-شعرو ادبیاتی کوردی- ب1- ص 28.

46-معجم المؤلفین العراقیین- فی القرنین التاسع عشر و العشرین- کورگیس عواد- مطبعە الارشاد- 1969- المجلد الاول- ص 150.

**سەرچاوە:**

**گۆڤاری بەیان، ژمارە 35، نیسانی 1976.**

ژمارەی

داهاتووی ڕۆڤار

تایبەتە بە کامەران موکری شاعیر





حەمە کاکە

لەچەند دێرێکدا:

-1937 لە سلێمانی لەدایک بووە.

-1961 بەشی شێوەکاری پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدای بە پلەی ئیمتیاز تەواوکردووە.

-چەندین پێشەنگەی تایبەتی کردۆتەوە.

ئێستا کارگێڕە لە گەلەری زاموا.

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

1-ئیبراهیم ئەحمەد.
2-محەممەد مەولود (مەم).
3-کەمال مەزهەر.
4-لەتیف حامد.
5-سوارەی ئیلخانی زادە.
6-محیێدین زەنگەنە.
7-ئەحمەد هەردی.
8-یەڵماز گۆنای.
9-محەڕەم محەممەد ئەمین.
10-دڵدار..
11-مەستورەی ئەردەڵانی.
12-مەولانا خالیدی نەقشبەندی.
13-جەمال عیرفان.
14-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس.
15-جەلالی میرزا کەریم.
16-ئیسماعیل بێشکچی.
17-عەبدول خالق مەعروف.
18-هێمن.
19-حسێن حوزنی موکریانی


(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوو مانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان

سلێمانی -فولکەی یەکگرتن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار ت / 3120690

لەدەرەوەی کوردستان Tel: 00441628477660 - Fax: 00441628486008

E-mail.

www.sardam-or\web mail

چاپخانەی (ڕەنج)

